# بەشی سێیەم

## شوێنی دەرچوونی پیتەکان ( مخارج الحروف )

ئەم بەشە بەگرنگترین بەشەکانی تەجوید دادەنرێت بۆیە پێویستە قورئان خوێن گرنگیەکی تەواوی پێبدات ئەویش بە:

١- ڕاستکردنەوەی مەخرەجی پیتەکان.

٢- پێدانی سیفەتی پیتەکان.

٣- ڕاهێنانی زمان و دەم تاوەکو دەبێتە خوو لەو کەسەدا.

هەر بۆیە (ابن الجزري) دەڵێت:

إذْ وَاجِبٌ عَلَيْهِمُ مُحَتَّمُ      قَبْلَ الشُّرُوعِ أَوَّلاً أَنْ يَعْلَمُوا

مَخَارِجَ الْحُرُوفِ وَالصِّفَاتِ      لِيَلْفِظُوا بِأَفْصَحِ اللُّغَاتِ

### پێناسەی مەخرەج:

بریتیە لەشوێنی دەرچوونی پیتەکان لەکاتی دەربڕینیاندا، یا ئەوشوێنەی کەدەنگی پیتەکە تێیدا کۆتایی دێت و بەهۆیەوە لەپیتەکانی تر جودا دەبێتەوە. مەخرەجەکانیش دوو جۆرن:

١- المخرجُ المحقّق: ئەو مەخرەجەیە کەپشت دەبەستێت بەبەشێکی دیاریکراو لەبەشەکانی گەروو یا زمان یا هەردوو لێو.

٢- المخرج المقدّر: ئەو مەخرەجەیە کە پشت بە شوێنێکی دیاریکراوی نابەستێت و لەو هەوایە پێك هاتووە کەلە هەردوو بۆشایی گەروو و دەم دایە، هەر بۆیە قبوڵی زیاد کردن و کەمکردنیش دەکات، ئەم مەخرەجەش هەرسێ پیتەکانی مەددی لێوە دەردەچێت.

## چۆنێتی دۆزینەوەی مەخرەج:

**بۆ دۆزینەوەی مەخرەجی هەر پیتێك لەپیتەكان (سكون) زەننە یان (شدّة) یەك بدە بەپیتەكەو لەپاش هەمزەیەكی جولاّو (متحرّك) ەوە بیخوێنەرەوە، لەهەر شوێنێكدا پیتەكە كۆتایی هات ئەوە مەخرەجی پیتەكەیە.**

**نموونە: بۆ دۆزینەوەی مەخرەجی پیتی (ب) دەڵێین: (أَبْ)، كەواتە مەخرەجی پیتی (ب) هەردوو لێوە.**

**بەلاّم بۆ دۆزینەوەی مەخرەجی پیتەكانی مەدد پیتێكی (فتحة)دار بخەرە پێش پیتی (ألف)و، پیتێكی (ضمّة)داریش بخەرە پێش پیتی (و)و، هەروەها پیتێكی (كسرة)داریش بخەرە پێش پیتی(ي).**

**بۆ نموونە: قَال، يقُول، قِيل.**

## پیتەكانی زمانی عەرەبی (الهجائي)

**پیتەكانی زمانی عەرەبی دەبن بە دووبەشەوە:**

**١- پیتە سەرەكیەكان: كە لەسەر ڕای زۆرینەی زانایان ژمارەیان (٢٩) پیتە، بۆیە (الطّيبي) دەڵێت:**

وَعِدَّةُ الْحُرُوفِ لِلْهِجَاءِ   تِسْعٌ وَعِشْرُونَ بِلَا امْتِرَاءِ[٥٦]

**أ، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، م، ن، هـ، و، لا[٥٧]، ي.**

---

[٥٦] المفيد في علم التجويد شهاب الدِّين أَحمد بن أَحمد بن بدرالدِّين بْن إبراهِيم الطِّيبِيّ ل٤ .

[٥٧] مەبەست لە(لا)لێرەدا پیتی ئەلیفە كە هەمیشە زەننەدارەو پێشەوەی (مفتوح)ە، لەزمانی عەرەبیشدا پیتی زەننەدار ناكەوێتە سەرەتاوە بەڵكو پێویستی بەپیتێك هەیە بكەوێتە پێشیەوە، جا زانایانی زمان (لغة) پیتی لامیان لەپێشەوەی داناوە، لەبەر ئەوەی پیتی ئەلیف خزمەتێكی زۆری

٢- پیتــە لاوەکیــەکان: بریتیــە لەوپیتانــەی کەلــەنێوان دوو مەخرەجـدا دەردەچن و، لەنێوان دوو پیتدا دەخوێنرێنەوە، ژمارەیـان هەشـت پیتـە، بەڵام دوانیان پەیوەندیان بە ریوایەتی(حفص)ەوە نیە بۆیە باسیان لێوە ناکەین:

١- هەمزەی ئاسانکراو (الهمزة الْمُسَهَّلَة): لەنێوان هەمزەو ئەلیفدا دەخوێنرێتەوە، وەك هەمزەی دووەمی وشەی ﴿ءَاْعۡجَمِیٌّ﴾ (فصلت: ٤٤)

٢- ئەلیفی لارکراو (الألف الْمُمَالَة): لەنێوان ئەلیف و یائدا(هاو شێوەی پیتی ێ) دەخوێنرێتە وەو تەنها لەم وشەیەدا هاتووە: ﴿مَجۡرٜىٰهَا﴾ (هود: ٤١)

٣- ئــەلیفی گــەورە (الألــف المفخمــة): ئــەو ئەلیفەیــە کــە بــە گــەورەبی دەخوێنرێتــەوە ئــەویش بــەهۆی هــاتنی بــەدوای پیتێکــی بــەرزدا، وەك: ﴿الطَّآمَّة﴾، ﴿خالدون﴾.[٥٨]

٤- لامی گەورە (اللام المفخمة): ئەویش لە وشەی پیرۆزی (الله)دا. وەك: ﴿عَبۡدُ اللَّه﴾، ﴿قَالَ اللَّهُ﴾[٥٩]

٥- نون و (تنوین)ی شاراوە: بەهۆی تێکەڵبونیان لەگەڵ پیتی دوای خۆیان دەبنە پیتێکی ناتەواو ولاوەکی.

---

پێشکەش بە پیتی لامی زەننەداری ناساندن (تعریف) کردووەو پێویستە ئەمیش خزمەتێك بەپیتی ئەلیف پێشکەشبکات .(وانەکانی دکتۆر أیمن سوید).

[٥٨] چونکە پیتی ( ا ) پیتێکی بچووك (مرقق)ە. ( د. دیاری )

[٥٩] چونکە پیتی ( ل ) پیتێکی بچووك (مرقق)ە. ( د. دیاری )

**وەك:** ﴿ كنتم﴾، ﴿تنظرون﴾

**٦- میمی شاراوە: ئەگەر زەننەداربێت و بەدوایدا پیتی (ب) هاتبێت**

**وەك:** ﴿أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ﴾ (البقرة:٣٣)

**سوود:**

**لەڕاستیدا پێناسەی پیتە لاوەکیەکان بەسەر (لامی گەورەو، نونی زەننەدارو (تنوین)و، میمی شاراوە)دا جێبەجێ نابێت، چونکە نە لەنێوان دوو مەخرەجدا دەردەچن و، نە لە نێوان دوو پیتدا دەخوێنرێنەوە، بەڵکو پیتی لام تەنها بەگەورەیی دەخوێنرێتەوەو، هەردووپیتی نون و میمیش مەخرەجیان پوك (الخیشوم)ە.**[٦٠]

## ژمارەی مەخرەجەکان

**لەسەر ڕای زۆرینەی خوێنەرانی قوڕئان (جمهور القرّاء) مەخرەجی پیتەکان حەڤدە مەخرەجن کەپێیان دەگوترێت: ( مەخرەجە تایبەتەکان)، ئەم بۆچوونەش پەسەند کراوە لەلایەن (خلیل)ی کوڕی (أحمد)ی (الفراهیدي)و هەروەها (ابن الجزَري)یش (ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لە پێشەکیەکەیدا دەڵێت:**

مَخَارِجُ الحُروفِ سَبْعَةَ عَشَرْ     عَلَى الْذِي يَخْتَارُهُ مَنِ اخْتَبَرْ.

---

[٦٠] **بڕوانە: نهایە القول المفید ل٥٠.**

**جا خوێنەری بەڕێز، ئەم حەڤدە مەخرەجە تایبەتانە دابەش دەبن بەسەر پێنج مەخرەجی گشتیدا کە ئەمانەن:**

**١- هەردوو بۆشایی گەروو و دەم (الجوف ) (یەك مەخرەج)**

**٢- گەروو (الحلق ) (سێ مەخرەج)**

**٣- زمان (اللسان ) (دە مەخرەج )**

**٤- هەردوو لێو (الشّفتان) (دوو مەخرەج)**

**٥- کەپوو (الخیشوم ) ( یەك مەخرەج)**



**مەخرەجی یەکەم: هەردوو بۆشایی گەروو و دەم (الجوف):**

**بریتیە لە بۆشایی گەروو و دەم، ئەویش پیتەکانی مەدد لەخۆ دەگرێت کە ئەمانەن:**

**أ-(ئەلیف)ی زەننەدار پیتی پێشەوەی سەر (فَتْحَة)ی هەبێت، وەکو: (قَالَ).**

**ب-(واو)ی زەننەدار پیتی پێشەوەی بۆر (ضَمَّة)ی هەبێت، وەکو: (يقُولُ).**

**ج-(ي)ی زەننەدار پیتی پێشەوەی ژێر (كَسْرَة)ی هەیبێت، وەکو: (قِيلَ)**

**ئەم سێ پیتەش لە وشەی (نُوحِيهَا)ی ئایەتی:** ﴿تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ﴾ (هود : ٤٩) **کۆبوونەتەوە.**

**ئەم مەخرەجەش (تقديري) مەزەندەکراوەو شوێنێکی دیاریکراوی نیەو هەردوو بۆشایی گەروو دەم دەگرێتەوەو، پێشیان دەگوترێت (الحروف الهوائية)پیتە هەواییەکان چونکە کۆتاییان دێت بە کۆتایی هاتنی دەنگەکە لەهەوادا، هەر بۆیە قبوڵی زیادکردن و کەمکردنیش دەکەن.**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

فَأَلِفُ الجَوْفِ وأُخْتَاهَا وَهِي حُرُوفُ مَدٍّ لِلْهَوَاءِ تَنْتَهِي




**مەخرەجی دووەم: گەروو (الحلق):**

**لەگەرووودا سێ مەخرەج بۆ شەش پیت هەیە:**

**١- دوورترینی گەروو (أقصى الحلق): (کەلە سنگەوە نزیکە)، هەردوو پیتی (الهمزة:ء)و (ه)ی لێوە دەردەچێت، بەڵام مەخرەجی (ء) دوورترە لە مەخرەجی (ه). نموونە:** ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾

**٢- ناوەڕاستی گەروو (وسط الحلق): کەهەردوو پیتی (ع) و (ح)ی لێوە دەردەچێت، بەڵام مەخرەجی (ع) دوورترە لەمەخرەجی (ح).**

**نموونە:** ﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (يوسف: ٦)

**٣- نزیکترینی گەروو (أدنى الحلق): (کەلەدەمەوە نزیکە)و هەردوو پیتی (غ)و (خ)ی لێوە دەردەچێت، بەڵام مەخرەجی (خ) نزیکترە لە دەمەوە لەمەخرەجی (غ).**

**نموونە:** ﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا﴾ (الحجر: ٤٧)

(ابن الجزري) دەڵێت:

ثُمَّ لأَقْصَى الحَلْقِ هَمْزٌ هَاءُ ثُمَّ لِوَسْطِهِ فَعَيْنٌ حَاءُ

أَدْنَاهُ غَيْنٌ خَاؤُهَا........ ..........................



## مەخرەجی سێیەم: زمان (اللسان):

**لەزماندا (١٠) مەخرەج بۆ (١٨) پیت هەیە:**




**١- دوورترینی زمان (أقصى اللسان): (کە لە گەرووەوە نزیکە) لەگەڵ ئەوبەشەی کەبەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم، ئەم مەخرەجەش پیتی (ق)ی لێوە دەردەچێت.**

**٢- دوورترینــی زمــان (أقصــی اللســان) کــەمێك پــێش مــەخرەجی (ق) لەگـەڵ ئەوبەشـەی بەرامبەریـەتی لەئاسمانـەی دەم، ئـەم مەخرەجـەش پیتی (ك)ی لێوە دەردەچێت.**

**کەواتە پیتی (ق) نزیکە لە گەرووەوە دوورە لەدەمەوەو، پیتـی(ك)یـش دوورە لە گەرووەوە نزیکە لەدەمەوە.**

**نموونە:** ﴿ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىۡءٍۖ﴾ (الزمر : ٦٢)

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| ......................والْقَافُ | أَقْصَى اللِّسَانِ فَوْقُ ثُمَّ الْكَافُ |
| أَسْفَلُ........................ | ........................................ |



٣- ناوەڕاستی زمان (وسط اللسان) لەگەڵ ئەو بەشەی بەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم، ئەم مەخرەجەش سێ پیتی لێوە دەردەچێت:

(ج) و (ش) و (ي) گەر مەدد نەبێت.

(ابن الجزري) دەڵێت:

..........وَالْوَسْطُ فَجِيمُ الشِّينُ يَا ..............................




### تێبینی:

یەکەم: مەبەست لەپیتی(ي) لێرەدا: پیتی مەدد نەبێت، بەڵکو بزواو (متحرّك) یان (ساكن) زەنەدار بێت و پێشەوەی ژێر (كسرة)ی نەبێت.

(يَعلمون )، (يُوقنون)، (يدَيِ اللَّه)، (علَيْهم).

دووەم: لەکاتی دەربڕینی پیتی (ج)دا پێویستە ناوەڕاستی زمان بنووسێت بە بەشی سەرەوەی پووك، بەلام بۆ پیتی (ش، ي) زمان نانوسێت بەپووكدا و تەنها لێ ی نزیك دەبێتەوە.

سوود: خوێنەری بەڕێز، پێش باسکردنی مەخرەجەکانی تر پێویستە هەندێ زانیاری لەبارەی ددانەکانەوە بزانیت.
مرۆڤ خاوەنی (٣٢) ددانە بەم شێوەیەی خوارەوە:

- بڕەڕ (الثنايا): چوار ددانەکەی پێشەوە، دوو لەسەرەوە و دوانیش لەخوارەوە.

- تەنیشتە بڕەڕ (الرَّباعيات): ئەمیش چوار ددانە دوو لەسەرەوە و دوانیش لەخوارەوە.

- کەڵبە (الأنياب): ئەمیش چوار ددانە بەهەمان شێوە.

- خڕێ (الأضراس): ئەمیش بیست ددانە دەبێت بەسێ بەشەوە:

یەکەم: (الضواحك) ئەو ددانانەی لەکاتی پێکەنیندا دەردەکەون، ژمارەیان چوار دانەیە لەدوای کەڵبەکان.
دووەم: هاڕەڕ (الطواحن) یا(الطواحين): دوازدە ددانی سەرو خوارەوەی لاشەویلگەکان، لەهەر لایەك سێ ددان.

سێیەم: ددانی ژیری (النواجذ): ئەمانیش چوارن. [٦١]
هەندێ لەزانایان بە هۆنراوە ڕوونیان کردۆتەوە:

للإنسان أسنان ثنايا رباعيه وأنياب كل كالضواحك أربع
طواحن ضعف الست أربعة أخر نواجذ فاعلمها إذ العلم أرفع.

---

[٦١] بڕوانە: الروضة النديّة شرح متن الجزرية: (٩/٢)، تاج العروس ل ( ٦٧٤١).




٤- یەكێك لە لێوارەكانی زمان (حافة اللسان) یان هەردووكیان لەگەڵ دیوی ناوەوەی دانەخڕێكانی سەرەوە (الأضراس العلیا)، كە هەستیارترین پیتی زمانی عەرەبی لێوە دەردەچێت ئەویش پیتی (ض)دە، بەڵام لێواری چەپی زمان لەگەڵ دانەخڕێ كانی لاتەنیشتی زیاتر بەكار دەهێنرێت و ئاسانترە، لای ڕاست كەمتر بەكاردەهێنرێت و قورسترە، بەكارهێنانی هەردوولاش بەهێزترو ناوازەترە.




سوود: فەرمودەی:(أنا أفصح من نطق بالضاد)

واتە: من ڕەوانبێژترین کەسم کەپیتی (ضاد)ی دەربڕیبێت.

هەردوو پێشەوا: (ابن كثير)و (ابن الجزري) دەڵێن: لا أصل له. [٦٢]

واتە: هیچ بنەمایەکی نیە، بەڵام بێگومان واتای فەرموودەکە ڕاستە.

(ابن الجزري) سەبارەت بە مەخرەجی پیتی (ض) دەڵێت:

................................ وَالضَّادُ مِنْ حَافَتِهِ إِذْ وَلِيَا

لَاضْرَاسَ مِنْ أَيْسَرَ أَوْ يُمْنَاهَا ..............................

---

[٦٢] بڕوانە: تفسير ابن كثير( ١/ ١٤٣)، النشر في القراءات العشر (٢٤٨/١).

٥- نزيكترينـی هـەردوو لێـواری زمـان (أدنـی حـافتي اللسـان) لەگـەڵ پووكی ددانەكانی سەرەوە (هەردوو دانی پێكەنين (الضواحك)و كەڵبـەو تەنيشتە بڕەڕو بڕەڕ) كە پيتی (ل)ی لێوە دەردەچێت .

ئـەم پيتــە فـراوانترين مـەخرەجی هەيــە، دەشـتوانرێ يـەك لای زمـان بـەكاربهێنرێ بـەڵام لای ڕاســت ئاسـانترە بـە پێچـەوانەی مـەخرەجی (ض)ەوە .

(ابن الجزري) دەڵێت:

............................ وَاللاَّمُ أَدْنَاهَا لِمُنْتَهَاهَا






٦- سەری زمان (طرف اللسان) لەگەڵ ئەو بەشەی کەبەرامبەریەتی لەپووکی هەردوو دانی بڕەڕی سەرەوە، کەمێك خوار مەخرەجی لام، ئەمیش پیتی (ن)ی ئاشکرای لێوە دەردەچێت.

تێبینی:

پیتی نونی شاراوە پیتێکی ناتەواوەو مەخرەجی نزیکی مەخرەجی ئەوپیتەوە کەتیایدا دەیشاریتەوە لەگەڵ پشتبەستن بە کەپوو (خیشوم).

مەخرەجی نونی تێهەڵکێشکراویش دەگۆڕێت بۆ مەخرەجی پیتی پاش خۆی.[٦٣]

(ابن الجزري) دەڵێت:

وَالنُّونُ مِنْ طَرَفِهِ تَحْتُ اجْعَلُوا ..............................




[٦٣] بڕوانە: تیسیر الرحمن في تجوید القرآن: د سعاد عبدالحمید ل ٥٩.

**٧- سەری زمان (طرف اللسان) وبەشێکی کەمیش لەپشتی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی کەبەرامبەریەتی لەپووکی دوو دانی بڕەڕی سەرەوە، کەمێك خوارەوەی مەخرەجی لام، ئەمیش پیتی (ر) ی لێوەدەردەچێت.**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

**وَالرَّا يُدَانِيهِ لِظَهْرٍ أَدْخَلُوا** ..............................



٨- سەری زمان (طرف اللسان) لەگەڵ پووکی بڕەڕی سەرەوە هەرسێ پیتی: (ط، د، ت)ی لێوە دەردەچن، بەڵام مەخرەجی (ط) دوورترینیانە لە بڕەڕو پاشان (د)و پاشانیش (ت).

(ابن الجزري) دەڵێت:

........................... ................ والصفَّيرُ مُسْتَكِنْ

مِنْهُ وَمِنْ فَوْقِ الثَّنَايَا السُّفْلَى ................................



٩- باریکایی زمان (أسلة اللسان)و بەشی سەرەوەی ددانەکانی بڕەڕی خوارەوە،[٦٤] لە گەڵ هێشتنەوەی بۆشاییەکی تەسك بۆ ڕاکردنە دەرەوەی هەوا، ئەم مەخرەجەش هەرسێ پیتی (س، ص، ز) لێوە دەردەچێت.

بەلاّم بۆشاییەکە لەپیتی (ص)دا تەسکترەو لەپیتی (ز)دا زیاترەو لەپیتی (س)دا مامناوەندە.

(ابن الجزري)یش دەڵێت:

وَالطَّاءُ وَالدَّالُ وَتَا مِنْهُ وَمِنْ         عُلْيَا الثَّنَايَا ..................




---

[٦٤] هەندێکیش لەزانایان گوتویانە بڕەڕەکانی سەرەوە، هەندێکی تریش گوتویانە نێوان هەردوو بڕەڕەکان، هۆی ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ زانای گەورە (سیبویە) ڕەحمەتی خوای لێبێت، چونکە ئەو دەستنیشانی نەکردووەو، بەڵکو زانایانی دوای خۆی قسەیان لێوە کردووە.
بڕوانە: الجامع الکبیر في علم التجوید ( ل ٤١٦-٤١٨ ).

١٠- سەری زمان (طرف اللسان)و بەشی خوارەوەی بڕەپڕەکانی سەرەوە کە هەرسێ پیتی:(ث، ذ، ظ)ی لێوە دەردەچێت.

بەڵام دەرکرنی زمان بۆ دەرەوە لەپیتی (ث)دا زیاترە لەدوو پیتەکەی ترو، لەپیتی (ذ)دا زیاترە لە پیتی (ظ).[٦٥]

(ابن الجزري)یش دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ........................ | وَالظَّاءُ وَالذَّالُ وَثَا لِلْعُلْيَا |
| مِنْ طَرَفَيْهِمَا ............ | ........................ |




[٦٥] بڕوانە: نهاية القول المفيد في علم التجويد ل ٥٨.

**مەخرەجی چوارەم: هەردوو لێو (الشَّفتان):**

**ئەم مەخرەجە گشتیەش دوو مەخرەجی تایبەت بۆ چوار پیت لەخۆ دەگرێت:**

**١- نێوان هەردوو لێو کە ئەم پیتانەی لێوە دەردەچێت:**

**أ - هەردوو پیتی (ب، م) ئەویش بەداخستنی هەردوو لێو، بەلاّم داخستنی هەردوو لێو لەپیتی (ب)دا زیاترە.**

**تێبینی: هەندێ زانایان بۆ جیاکردنەوەی مەخرەجی(ب)و (م) لەیەکتر گوتوویانە:**

**پیتی (ب) پیتێکی دەریایی (بحرية)یەو، پیتی (م) یش پیتێکی وشکایی (بريّة)یە.**

**واتە: لەکاتی داخستنی هەردوو لێودا بۆ پیتی(ب) پێویستە هەردوو دیوی ناوەوەی لێو (واتە: تەڕایی دیوی ناوەوەی هەردوو لێو ) بەر یەك بکەوێت.**

**بەلاّم لەکاتی داخستنی هەردوو لێودا بۆ پیتی(م) پێویستە هەردوو دیوی دەرەوەی لێو (واتە: وشکایی هەردوو دیوی دەرەوەی لێو ) بەر یەك بکەوێت.[٦٦]**

---

[٦٦] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل ٦٧.




ب – پیتـــی (و) – گـــەر پیتـــی مـــەدد نـــەبێت – ئـــەویش بـــە کردنەوەوخڕکردنی هەردوو لێو.

تێبینی:

مەبەست لەپیتی(و) کاتێك مەدد نەبێت، ئەمانەیە:

– (و)ی (فتحة)دار: { قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَد } { كُفُوًا أَحَد }.

– (و)ی (ضمّة)دار: { تَلْوُواْ ، الْوُسطَى ، الْوُثقَى }.

– (و)ی (کسرة)دار: { وِقْرا ، وِزْرَا }.

– (و)ی زەننەدار بەدوای (فتحة)دا هاتبێت: { يَومِهِم، قَولِهِم }.

٢– بەشی ناوەوەی لێوی خوارەوە لەگەڵ لێواری بڕەڕەکانی سەرەوە، ئەمیش پیتی (ف)ی لێوە دەردەچێت.

(ابن الجزري) دەڵێت:

.......وَ مِنْ بَطْنِ الشَّفَهْ: فَالْفَا مَعَ اطْرَافِ الثَّنَايَا الْمُشْرِفَهْ

لِلشَّفَتَيْنِ: الْوَاوُ بَاءٌ مِيمُ ..........................


پیتی( ف )


پیتی( و ) گەر مەدد نەبێت

## مەخرەجی پێنجەم: کەپوو (الخیشوم):

کەپوو (الخیشوم): ئەو کونەیە کە لوت دەگەیەنێت بەگەروو، ئەم مەخرەجەش مینگە (الغنّة) ی لێوە دەردەچێت.[٦٧]

(ابن الجزري) وتویەتی:

........................ وَغُنَّةٌ: مَخْرَجُهَا الْخَيْشُومُ

تێبینی:

مینگە پیتێك نیە بنوسرێت وشێوەشی نیە، لەبەر ئەوە هەندێك لەزانایان ڕەخنەیان لە (اِبن الجزري) گرتووە کە بەپیتێکی خاوەن مەخرەج دایناوە!

بۆیە باشتر وایە بە سیفەت یان بەپیتێکی لاوەکی حیسابی بۆبکرێت[٦٨]




[٦٧] پشت بەخوا لەکۆتایی سیفەتی پیتەکاندا بەدرێژی باسی مینگە دەکەین.

[٦٨] بڕوانە: تیسیر الرحمن في تجوید القرآن ل ٦٢– ٦٣.

## بەشی چوارەم

## نازناوی پیتەکان ( أَلقابُ الحروف )

پیتــەکانی زمــانی عــەرەبی نازناویــان پێــدراوە بــەگوێرەی شــوێنی دەرچــوونیان لــە مەخرەجەکانیانــەوە، یەکــەم کەســیش نازنــاوی بــۆ پیتەکان دانا خـەلیلی کوڕی ئەحمـەدی ئەلفەڕاهیـدی بـوو لەکتێبەکەیـدا بەناوی (العین)، کەئەمانەن:

١- پیتەکانی بۆشایی (الحروف الجوفیة): بەهەریەکێك لەسێ پیتەکـەی مەدد: ( ـَا، ـُو، ـِي) دەگوترێت، چونکە مەخرەجیان بۆشایی ناو گەروو دەمە.

٢- پیتە هەواییەکان (الحروف الهوائیة): ئەمیش هەر بە پیتەکانی مەدد دەگوترێـت چـونکە دەرچـونیان کۆتـایی دێـت بـەکۆتایی هـاتنی هـەوا لەدەمدا.

٣- پیتەکانی (الحروف الحلقیة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ء، ه، ع، ح،غ ،خ ) دەگوترێت، چونکە لەگەرووەوە دەردەچن.

٤- پیتەکانی زمانە بچکۆلە (الحروف اللَّهَویة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ك، ق) دەگوترێــت، چــونکە مــەخرەجیان نزیکــە لەزمانــە بچــکۆلەوە (اللَّهَاة).

٥- پیتـه شـەویلگەییەکان (الحـروف الشَّـجْرِیّة): لەسـەر ڕای بـەهێزی زانایـان بەهەریـەکێك لەپیتـەکانی (ج، ش، ض، ي) دەگوترێـت، چـونکە دراونەتە پاڵ کەلێنی نێوان هەردوو شەویلگە (شجْر الفم)ەوە.

٦- پیتەکانی سەری زمان (الحروف الذَّلْقِیة) یان (الذَّلَقِیة): بەهەریەکێك لەپیتـەکانی (ل، ن، ر) دەگوترێـت، چـونکە مـەخرەجیان سـەری زمانـە (ذَلْق اللسان).

٧- پیتـەکانی پێشـەوەی مەلاشـوو (الحـروف النِّطَعیّـة): بەهەریـەکێك لەپیتــەکانی (ط، ت، د) دەگوترێــت، چــونکە مــەخرەجیان پێشــەوەی ئاسمانەی دەم یا مەلاشوو (نطع الحنك)ە.

٨- پیتــەکانی باریکــایی زمــان (الحــروف الأَسَــلِیَّة): بەهەریــەکێك لەپیتــەکانی (ص، ز، س) دەگوترێت،چــونکە مــەخرەجیان باریکــایی زمانە (أسلة اللسان).

٩- پیتە پووکیەکان (الحروف اللِّثَویة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ظ، ذ، ث) دەگوترێت، چونکە لەنزیك پووکەوە دەردەچن.

١٠- پیتـە لێویـەکان (الحـروف الشَّـفَوِیّة) یـان (الشَّـفهیَّة): بەهەریـەکێك لەپیتــەکانی (ف، و، ب، م) دەگوترێــت، چـونکە مـەخرەجیان هــەردوو لێوە.

# سیفەتی پیتەکان

سیفەتی پیتەکان: بریتیە لەونیشانەو تایبەتمەندیانەی کە بەهۆیەوە پیتەکانی پێدەناسرێتەوەو، لەیەکتری جیادەکرێنەوە.

## سوودی زانینی سیفەتەکان:

١- جیاکردنەوەی ئەوپیتانەی کە لەمەخرەجدا هاوبەشن، بۆنموونە: هەرسێ پیتی (ث، ذ، ظ) کە مەخرەجیان پێشەوەی زمان وبەشی خوارەوەی بڕەڕەکانی سەرەوە.

٢- چاك دەربڕینی پیتەکان .

٣- ناسینی پیتە بەهێزو لاوازەکان.

## جۆری سیفەتەکان:

یەکەم: سیفەتە هۆگرەکان ( الصفات اللازمة ): ئەو سیفەتانەن کەبەشێکن لەپیتەکەو هەرگیز لێ ی جیا نابنەوە، ژمارەشیان لەسەر ڕای بەناوبانگی زانایان حەڤدە سیفەتە.

دووەم: سیفەتە کاتیەکان ( الصفات العارضة): ئەو سیفەتانەن کەتەواوکەری پیتەکەن و لەهەندێ حاڵەتی دیاریکراودا تووشی دەبن و لەهەندێ حاڵەتیشدا لەبەر هۆکارێ لەهۆکارەکان لێی جیادەبنەوەو، کاریگەرییان لەسەر خودی پیتەکە نیە لەکاتی جیابوونەوەیاندا، وەك: إخفاء و إدغام و تفخیم و هتد ... [٦٩]

پشت بەخوای گەورە دوای سیفەتە هۆگرەکان باسیان لێوە دەکەین.

---

[٦٩] بڕوانە: هداية القاري إلى تجويد كلام الباري للمرصفي ل٤٤.

## یەکەم: سیفەتە هۆگرەکان ( الصفات اللازمة )

ئەم سیفەتانەش دەبن بەدوو بەشەوە:

١- سیفەتە دژ یەکەکان ( الصفات المتضادّة ): پێنج کۆمەڵەن و لەهەر کۆمەڵەیەکدا دوو سیفەتی دژبەیەك هەیە ئەگەر یەکێك لەو دوو سیفەتە لەپیتێکدا بەدیکرا ئیدی ئەوی تریانی تێدا بەدیناکرێت. بەڵام پێویستە هەموو پیتێك یەکێکیانی تێدا بەدیبکرێت.

پێنج کۆمەڵەکەش ئەمانەن:

## الهمس والجهر

**الهمس**

لە زمانەوانیدا: دەنگی نزم و ئەسپایی.

لەزاراوەشدا: بیستن بەئەسپایی بەهۆی کردنەوەی دەنگە ژێ یەکان (الوتران الصوتیان) و نەلەرزینیان و دەرچوونی زۆرێك لەهەوای هەناسە.

پیتەکانی: (١٠) پیتن و (ابن الجزري) لەم وتەیەدا کۆی کردوونەتەوە: (فحثه شخص سکت)[٧٠] واتە: بێدەنگ بوو، کەسێك هانیدا بۆ قسەکردن. ئەم پیتانەش لەناو خۆیاندا وەك یەك نین، بەڵکو هەندێکیان لەهەندێکی تریان لاوازترن، بۆ نموونە پیتی (ص) لەوانی تر بەهێزترە چونکە سیفەتی (إطباق) و (إستعلاء) و (صفیر)ی هەیە کە ئەمانە سیفەتی بەهێزن و، پاشان پیتی (خ)دێت چونکە سیفەتی (إستعلاء)ی هەیە.

---

[٧٠] لەبنەڕەتدا (سکت فحثه شخص) لەبەر ناچاری شیعری (الضرورة الشعرية) پاش و پێش خراوە. (وانەکانی د أيمن سويد)

هـەروەها پیتـی (ك، ت) لەپیتـەکانی تـر بـەهێزترن جگـە لـە (ص، خ)، لەهەمووشـیان لاوازتـر پیتـی (ھ)یـە هـەر بۆیـە ئـەم پیتـەیان بـە مـەددی (صلة) بەهێز کردووە.[٧١] پاشانیش (ف)و (ح)و (ث).

(ابن الجزري)یش دەڵێت:

مَهْمُوسُهَا: (فَحَثَّهُ شَخْصٌ سَكَتْ) ...............................




[٧١] نهاية القول المفيد في فن التجويد ل ٦٩.

**الجهر**

**له زمانهوانیدا: دهنگ بهرزی.**

**لهزاراوهشـدا: بیسـتن بـهڕوونی بـههۆی داخسـتنی دهنگـه ژێ یـهكان (الوتران الصوتیان) و لهرزینیان و گیرانی زۆرێك لهههوای ههناسه.**

**پیتـهكانی : (١٩) پیتهكـهی تـری زمـانی عـهرهبی دهگرێتـهوه كهلـهم وتهیهدا كۆكراونهتهوه ( عَظمَ وَزْنُ قَارِىءِ ذِي غَضٍّ جِدٍّ طَلَب ).**

**واته: پلهو پایهی بهرزه ئهو قوڕئان خوێنهی چاوی لهحهڕام دهپارێزێت و كۆشش دهكات بۆ وهدهست هێنانی زانست.**

**ئـهم پیتانـهش لـهڕووی بههێزیـهوه جیـاوازن، پیتـی (ط) لهھـهمویان بههێزتره پاشانیش (د).**

**(ابن الجزري) دهڵێت:**

صِفَاتُهَا جَهْرٌ وَ رِخْوٌ مُسْتَفِلْ          مُنْفَتِحٌ مُصْمَتَةٌ وَالضِّدَّ قُلْ



## الشدّة والرّخاوة

**الشدّة**

**له زمانەوانیدا: بەهێزی.**

**لەزاراوەشدا: گیران یان ڕێنەکردنی دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا لەبەر تەواوی پشت بەستنی بەمەخرەجەکەیەوە (یان لەبەر داخستنی مەخرەجەکەی).**

**ئەم ڕێنەکردنەش کاتێك دەردەکەوێت پیتەکە زەنندەداربێت.**

**پیتەکانی: (٨) پیتن لەم ڕستەیەدا (ابن الجزري) کۆی کردوونەتەوە (أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ).**

**واتە: گوێم لێیە (قط) دەگری. (قط)ناوی ئافرەتێکە.**

**ئەم پیتانەش لەڕووی بەهێزییەوە لەیەکتر جیاوازن، ئەگەر لەگەڵ سیفەتی (شدة)دا سیفەتی(جهر) و(إستعلاء)و (إطباق) هەبوو ئەوە ئەوپەڕی بەهێزییە، وەك پیتی (ط).**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

**شَدِيْدُهَا لَفْظُ (أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ) ..............................**

**الرِّخاوة**

**له زمانەوانیدا: نەرم ونیانی.**

**لەزاراوەشدا: ڕێکردنی دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا.**

**پیتەکانی: (١٦) پیتن: (ث، ح، خ، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ظ، غ، ف، هـ، و، ي، ا)**

**هەندێ لەزانایان بەشیعر هۆنیویانەتەوە:**

رخو من الحروف ست وعشرْ ... حاء وخاء وذال زاي ذا اشتهرْ

ثاء وسين ثم شين وألفْ ... صاد وضاد ثم ظاء واو عرفْ

والغين ثم الفاء ثمّ الهاءُ ... وقد أتى في ختمهنَّ الياءُ






**هــەروەها لــەنێوان ( الشــدّة ) و ( الرّخــاوة )شــدا ســيفەتی مامناوەنــد ( التوسط ) يا نێوان (البينيّة) هەيە كەدەنگ تيايانـدا بەتـەواوی ناگيرێت و بەتەواويش رێناكات.**

**پيتــەكانی: (٥) پــيتن و، (ابــن الجــزري) لــە ڕســتەی (لِــنْ عُمَــر)دا كۆيكردوونەتەوە.**

**واتە: نەرم ونيان و لەسەرخۆبە ئەی (عمر).**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

وَبَيْنَ رِخْوٍ وَالشَّدِيدِ ( لِنْ عُمَرْ)          ............................




نێوان: ڕێكردنی بەشێك لەدەنگی پیتەكە بەهۆی دانەخستنی تەواوی مەخرەجەكەی .

سوود: پیتەکانی زمانی عەرەبی لەڕوی ڕێکردنی دەنگو هەناسەو ڕێنەکردنیانەوە دەبن بەپێنج کۆمەڵەوە:[٧٢]

١- (شديدة مجهورة): (٦) پیتن ( قطب جد+الهمزة)
لەم (٦) پیتەدا دەنگو هەناسە بەهیچ شێوەیەك ڕێناکەن و بواری هاتنەدەرەوەیان نیەو، قورساییەك دروست دەکەن لەکاتی دەربڕیندا، بۆیە عەرەب (قلقلة)یان داناوە بۆ پیتەکانی (قطب جد)و، –زۆربەشیان– ئاسانکردن (تسهيل)یان داناوە بۆ پیتی (همزة).

٢- (شديدة مهموسة): هەردوو پیتی (ك، ت)
ئەم دوو پیتەش لەسەرەتای دەربڕینیاندا دەنگ لەگەڵیاندا دەرناچێت، بەڵام لەکۆتایی دەربڕینیادا هەناسە دەردەچێت.
هەربۆیە هەندێ لەزانایان وتویانە پیتی (ك، ت) لەسەرەتاوە بەهێز (شدید)ن لەکۆتاییشدا ئەسپایی (مهموس)ن.

٣- (مجهورة رِخْوة): بریتیە (ض، ظ، ذ، غ، ز، (و ي لين)و پیتەکانی مەدد).
ئەم پیتانەش دەنگ لەگەڵیان ڕێدەکات و هەناسە لەگەڵیان دەگیرێت و ڕێناکات.

٤- (مهموسة رِخوة): (فحثَّهُ شخصٌ س) (ف، ح، ث، ه، ش، خ، ص، س)

[٧٢] بڕوانە: تيسير الرحمن في تجويد القرآن ل ٧٩ دواتر.

**ئەم پیتانەش دەنگ بەتەواوی لەگەڵیاندا ڕێدەکات بەهۆی لاوازی پشتبەستنیان بەمەخرەجەکانیانەوە، هەناسەش بەتەواوی لەگەڵیاندا ڕێدەکات بەهۆی کردنەوەی دەنگەژێ یەکان (الوتران الصوتیان).**
**بۆ نموونە: (أَسْ)، (أَخْ)، (أَشْ)**

**٥- (متوسطة مجهورة): (لِنْ عمر)**
**ئەم پیتانەش هەناسە لەگەڵیاندا ڕێناکات، بەڵام دەنگ بەشێوەیەکی مامناوەند لەگەڵیاندا ڕێدەکات.**
**بۆ نموونە: (أَلْ)، (أَنْ)، (أَرْ)**

**تێبینی:**

**١- هەموو پیتەکانی (همس) سیفەتی (رِخاوة)یان تێدایە جگە لە (ك، ت) کە دوو پیتی بەهێز (شدید)ن.**

**٢- هەمو پیتە بەهیز (شدید)ەکان سیفەتی (جهر)یان تێدایە جگە لە (ك، ت) کە دوو پیتی ئەسپایی (همس)ن.**

**٣- ماوەی پیتەکانی (الرِّخاوة) درێژترن لەماوەی پیتەکانی (البینیّة)و، ماوەی پیتەکانی (البینیّة)ش درێژترن لەماوەی پیتەکانی (الشدة).[٧٣]**

[٧٣] **أطلس التجوید ل ٦١.**

## الإستعلاءُ والإستفال

**الإستعلاء**

**له زمانەوانیدا: بەرزی.**

**لەزاراوەشدا: بەرزکردنەوەی ڕێڕەوی دەنگ بەرەو مەلاَشووی دەم.**

**پیتەکانی (٧) پیتن و (ابن الجزري) له پێشەکیەکەیدا وتویەتی:**

.......................... وَسَبْعُ عُلْوٍ (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) حَصَرْ

**ڕستەی (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) لەڕووی واتاوە دوو ئامۆژگاری لەخۆ دەگرێت:**

**یەکەم: لەگەرمای هاویندا بەخانویەکی لەقامیش دروستکرای تەسك و بچووکدا قەناعەت بکە.**

**( قِظ): بمێنەرەوە، ( خُصَّ): خانووی له قامیش دروستکراو.**

**دووەم: بێدار بەرەوە قەبر گۆ ڕشانی هەیە.**

**( قِظ): بێدار بەرەوە، (ضَغط) گۆ ڕشان.**

**سوود: مەرج نیە بۆ دەربڕینی هەموو پیتەکانی (الاستعلاء) کۆتایی زمان بەرزبێتەوە، وەك لەزۆربەی کتێبەکانی تەجویدا هاتووە، چونکە پیتی (خ، غ) مەخرەجیان گەرووەو پەیوەندیان بەزمانەوە نیەو تەنها ئاڕاستەی دەنگیان بەرەو مەلاَشوو بەرزدەبێتەوە.[٧٤]**

---

[٧٤] بڕوانە: نهاية القول المفيد في فن التجويد: محمد مكي نصر ل ٧٤، لەچاپی یەکەمدا منیش هەمان پیناسەم لەو کتێبانەوە وەرگرتبوو.

بــەرزترین پیتــەکانی (اســتعلاء) پیتـــی (ق)و، بـــەهێزترینیان (ط)و نزمترینیان پیتی (خ)یە.

**الإستفال**

له زمانەوانیدا: نزمی.

لەزاراوەشــدا: نــزم کردنــەوەی ڕێــڕەوی دەنگــو دابــەزینی لەتــەختایی دەمدا.

پیتەکانی: (٢٢) پیتەکەی تری زمانی عەرەبین:

(ء، ب، ت، ث، ج، ح، د، ذ، ر، ز، س، ش، ع، ف، ك، ل، م، ن، ه، و، ي، ا).

هەندێك لەزانایان لەم ڕستەیەدا کۆیانکردۆتەوە:

(ثَبَتَ عِزّ مّنْ يُجَوّدْ حَرْفَهُ إذ سَلَّ شَكا)[٧٥]




بەرزبوونەوەی دەنگ بە پیتێکی (اِستعلاء)

نزمبوونەوەی دەنگ بە پیتێکی (اِستفال)

[٧٥] بڕوانە: إحكام الأحكام في تجويد القرآن ل٣٩.

# الإطباق والإنفتاح

**الإطباق**

**له زمانەوانیدا: لکاندن.**

**لەزاراوەشدا: لکاندنی زمان یان بەشێکی بەئاسمانەی دەم (مەلاشوو)ەوە، بە شێوەیەك كەدەنگ پەنگ بخواتەوە لەنێوانیاندا لەكاتی دەربڕیندا.**

**پیتەكانی: (٤) پیتن (ص، ض، ط، ظ ).**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

وَصَادُ ضَادُ طَاءُ ظَاءٌ مُطْبَقَهْ ............................. .

**تێبینی:**

**١- پیتی (ط) بەهێزترینیانەو (ظ)یش لاوازترینەو (ض، ص)یش مامناوەندن.**

**٢- سیفەتی (إطباق) تایبەترە لە سیفەتی (إستعلاء) واتە هەموو پیتەكانی (إطباق) سیفەتی (إستعلاء)یان تێدایە، بەڵام مەرج نیە هەموو پیتێكی (إستعلاء) سیفەتی (إطباق)یان تێدا بێت.[٧٦]**

[٧٦] بڕوانە: نهاية القول المفيد في فن التجويد: محمد مكي نصر ل ٧٧.

**الإنفتاح**

**له زمانەوانیدا: جیابوونەوە، دوورکەوتنەوە.**

**لەزاراوەشدا: دوورخستنەوەی زمان یان زۆرینەی لەئاسمانەی دەم (مەلاشوو) لەکاتی دەربڕیندا.**

**پیتەکانی: (٢٥) پیتەکەی ترن و، لەم وتەیەدا کۆکراونەتەوە:**

**(من أخذ وَجد سعة فزکا حق له شرب غیث)** [٧٧]

**واتە: هەرکەسێك زەکاتی سامانەکەی دەرکات، مافە بەسەر پەروەردگارەوە بەزەیی خۆی بەسەردا بڕژێنێت.**




به پیتی ( إنفتاح ) دەنگ پەنگناخواتەوە

به پیتی( إطباق )دەنگ پەنگدەخواتەوە

---

[٧٧] هەمان سەرچاوە ل ٧٧.

سوود: بەهۆی لێکدانەوەی ئەم چوار سیفەتە (الاستعلاءُ والإستفال) و (الإطباق والإنفتاح) دوو خاڵمان بۆ ڕووندەبێتەوە:

١- پیتەکانی (إستعلاء) دەبن بە دوو بەشەوە:

أ- (حروف مستعلية مطبقة): (٤) پیتن (ص، ض، ط، ظ)

گەر سەرنج بدەین بۆمان ڕووندەبێتەوە کەئەم پیتانە قەڵەوترن لەپیتە (مستعلية منفتحة)کان، بۆنموونە سیفەتە بەهێزەکانی پیتی(ق) زیاترە لەسیفەتە بەهێزەکانی پیتی (ص) بەڵام پیتی (ص) قەڵەوترە لە پیتی (ق) ئەویش لەبەر بونی سیفەتی (اطباق) لەپیتی دووەمدا.

ب- (حروف مستعلية منفتحة): (٣) پیتن (ق، غ، خ)

لە کاتی دەربڕینی ئەم سێ پیتەدا کۆتایی زمان بەرەو مەلاشوو بەرز دەبێتەوە بێئەوی پێوەی بنووسێ، بۆیە قەڵەوییان کەمترە لەپیتە (مستعلية مطبقة)کان.

کەوابوو پێویستە لەکاتی خوێندنەوەدا جیاوازبن بۆنموونە: (الطَّامَّة) و(الخالدون).

٢- کاریگەری ژێر (کسرة) لەسەر پیتە (مستعلية منفتحة)کان زیاترە لەسەر پیتە (مستعلية مطبقة)کان، چونکە یەکەمیان کاریگەری (کسرة) و (إنفتاح)ی لەسەرە، بەڵام دووەمیان تەنها لەژێر کاریگەری (کسرة) دایە، بۆنموونە پیتی(ظ)ی ژێردار (مکسور) لەوشەی (ظِلّ) قەڵەوترە لەپیتی (غ)ی ژێردار لەوشەی (غِلّ )دا.[٧٨]

---

[٧٨] بڕوانە: تيسير الرحمن في تجويد القرآن ل ٨٦-٨٧.

# الإذلاق والإصمات

**الإذلاق**

**له زمانەوانیدا: تیژی، قەراخ، ڕەوانبێژی.**

**لەزاراوەشـــدا: دەربڕینـــی پیتـــەکانی بـــەخێرایی و بەئاســـانی، لەبـــەر دەرچوونیان لەپێشەوەی زمان یا هەردوو لێوەوە.**

**(ابن الجزري) لەم ڕستەیەدا کۆیکردوونەتەوە:**

وَ (فِرَّ مِنْ لُبِّ) الحُرُوفِ المُذْلَقَهْ ........................

**واتە: لەدەست ژێرەکە ڕاکە.**

**(ل، ن، ر) مـــەخرەجیان پێشـــەوەی زمانـــەو، (ف، م، ب) مـــەخرەجیان هەردوولێوە.**

**الإصمات**

**له زمانەوانیدا: ڕێگرتن.**

**لەزاراوەشـــدا: ڕێگـــرتن لـــە کۆبوونـــەوەی پیتـــەکانی بەتـــەنها– بـــەبێ پیتـــەکانی (إذلاق)– لـــە وشـــەی چـــوار پیتـــی و پپـــنج پـــیتی بنـــەڕەتی (أصل)یدا.**

**پیتەکانی: (٢٣) پیتەکەی ترن و لەم وتەیەدا کۆکراونەتەوە:**

**(جز غش ساخط صید ثقة إذ وعظه یحضك).**

**واتە: له فێڵبازو حەق نەویست خۆت بەدوور بگرەو، بەشوێنی مرۆڤی خاوەن متمانەدا بکەڕێ، چونکە ئامۆژگاریەکانی هانت دەدەن بۆ چاکە کردن.**

هەر بۆیە گوتویانە هەریەك لە وشەی (عَسجد: ئاڵتوون )و (عَسَطُوس: درەختێکە)، ئەعجەمیین (هێنراوەتە ناو زمانی عەرەبیەوە)، چونکە لە سێ پیتی بنەڕەتی (أصلي) زیاتر پێك هاتوون و پیتی (إذلاق)یشیان تێدا نیە.

تێبینی: خوێنەری بەڕێز، ئەم دوو سیفەتە (الإذلاق والإصمات) بابەتێکی زمانەوانی (لغوي)ن و هیچ پەیوەندییان بە زانستی تەجویدەوە نیە، ڕەنگە هۆی باسکردنیشیان ئەوە بووبێت تاوەکو ژمارەی سیفەتەکان بگەنە (١٧) سیفەت و لەگەڵ ژمارەی مەخرەجەکان یەکسان بن، هەر بۆیە زۆرێك لە توێژەران ئەم دوو سیفەتەیان فەرامۆش کردووە.[٧٩]

[٧٩] بڕوانە: فتح رب البريّة شرح المقدمة الجزرية ل ١٣، أحكام قراءة القرآن الكريم للحصري ل ٩٧.

## ٢- سیفەتە بێ دژەکان:

**سیفەتی یەکەم: (الصَّفير)**

**لەزمانەوانیدا: دەنگی تیژ، دەنگی باڵندە، فیکە.**

**لە زاراوەشدا: دەنگێکە لەدەنگی باڵندە دەچێت، لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا لەنێوان بڕەڕو سەری زمانەوە دێتەدەرێ.**

**پیتەکانی: (٣) پیتن (ص، ز، س) (ابن الجزري)یش لە نیوە دێڕێکدا کۆی کردوونەتەوە:**

صَفِيرُهَا صَادٌ وَزَايٌ سِينُ ............................

**دەنگی پیتی(ص) لەدەنگی(وَز)[٨٠] دەچێت و، دەنگی پیتی (ز) لە دەنگی هەنگ دەچێت و، دەنگی پیتی (س) لەدەنگی کوللە دەچێت. بەهێزترینی ئەم پیتانەش پیتی (ص)ە لەبەر بوونی سیفەتی (إستعلاء) و (إطباق)و، پاشانیش (ز)یە لەبەر بوونی سیفەتی (الجَهر) تێیانداو، پیتی (س)یش لاوازترینیانە لەبەر بوونی سیفەتی (الهمس) و(الرِّخاوة) تێیدا، بۆیە پێویستە سیفەتی (صفیر)ی پیتی (س) بەهێزتربێت لەپیتی (ز) چونکە دوو سیفەتی لاوازی تێدایەو، هەروەها دەبێت سیفەتی (صفیر)ی پیتی (ز)یش بەهێزتربێت لە پیتی (ص) چونکە ئەمیش سیفەتێکی لاوازی تێدایە.**

---

[٨٠] باڵندەیەکە لە قاز دەچێت، بەلاّم هەڵدەفڕێت.

پلەکانی (الصَّفير):
١- بەهێز: ئەگەر (شدّة)داربوو: (السَّامريّ)، (الزّكاة)، (الصَّلاة).
٢- مامناوەند: ئەگەر زەنننەدار بوو (يُوَسْوِسُ)، (بالأَزْلام)، (واصْطبر).
٣- لاواز: ئەگەر بزواو (متحرك) بوو.[٨١]

سیفەتی دووەم: (القلقلة)
لەزمانەوانیدا: جووڵەو بزوتن، لەرینەوە.
لەزاراوەشدا دەرخستنی دەنگێکی بەهێز لەکاتی زەنننەداری پیتەکانیدا.
پیتەکانی: (٥) پیتن و، (ابن الجزري) لەم ڕستەیەکدا کۆیکردوونەتەوە:

.................... قَلْقَلَةٌ (قُطْبُ جَدٍّ).......

واتە: جەمسەری گەورەیی.
ئەم پێنج پیتە سیفەتی (شِدّة)و (جَهر) یان تێدایەو نابێت لەکاتی دەربڕیندا دەنگ و هەناسە لەگەڵیاندا بێتە دەرێ، لەبەر ئەوە پێویستییان بە (قلقلة) دەبێت تاوەکو دەنگی پیتەکان دەرکەون .

## ڕیزبەندی پیتەکانی (قلقلة) لەڕووی بەهێزی و ڕوونیەوە:

لەڕووی بەهێزیەوە پیتی (ط) بەهێزترینیانەو، پیتی (ق)یش لەپلەی دووەمدایەو، پاشان هەرسێ پیتەکەی تر (ب، د، ج) لەپلەی سێیەمدا دێن.
لەڕووی ڕوونیشەوە پیتی (ق) ڕوونترینیانەو، پاشان پیتەکانی تر.

---

[٨١] الجامع الكبير في علم التجويد ل (٢/ ١٠٣)

بەشەکانی (قلقلة):

١- (قلقلة)ی بچووك: ئەگەر پیتەکە زەنننەدار (ساکن) بێت و، قورئان خوێن لەسەری نەوەستێت.

وەك: (يقْدر)، (أفتطْمعون)، (فاستجبْنا)، (يجْهلون)، (يَدْعون).

٢- (قلقلة)ی گەورە: ئەگەر پیتەکە زەنننەدارو لە حاڵەتی وەستان (وقف)دا بێت و (شَدّة)دار نەبێت.

وەك: (واقْ)، (محيطْ)، (عذابْ)، (مريجْ)، (بعيدْ).

٣- (قلقلة)ی گەورەتر: ئەگەر پیتەکە (شَدّة)دارو لەکۆتایی وشەداو لە حاڵەتی وەستان (وقف)دا بێت.

وەکو: (الحجّ)، (الحقّ)، ( وتبّ)، (أشدّ).[82]

(ابن الجزري) دەڵێت:

وَبَيِّنَنْ مُقَلْقَلاً إِنْ سَكَنَا وَإِنْ يَكُنْ فِي الْوَقْفِ كَانَ أَبْيَنَ




[82] سەرچاوەی پێشوو (١٢٢/٢)

**سیفەتی سێیەم: (اللِّین)**

**لەزمانەوانیدا: ئاسانی.**

**لەزاراوەشدا دەرچوونی پیتەکە لەمەخرەجەکەیەوە بەئاسانی .**

**پیتەکانی: دوو پیتن (و، ي) کاتێك زەنندداربن و پێشەوەیان سەر (فتحة) بێت (واتە پیتی مەدد نەبن).**

**نموونە: (خَوْف، هَیْت، بَیْت، غَیر، نَوم، بَیع، شَيء، قَوْل )**

**پێشەوا (ابن الجزري)یش دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| ...................... | ..............واللینُ |
| واوٌ وياءُ سُكِّنَا وانفَتَحَا | قبلَهُما............. |

**سیفەتی چوارەم: (الإنحراف)**

**لەزمانەوانیدا: لادان.**

**لەزاراوەشدا: حەزو لادانی دەنگی پیتەکە لەبەر ڕێنەکردنی بەتەواوی ئەویش بەهۆی ڕێگرتنی لەلایەن زمانەوە.[٨٣]**

**پیتەکانی: تەنها دوو پیتن: (ل، ر)**

**لادانی دەنگی پیتی (ل) بەرەو هەردوو لای پێشەوەی زمان ئەویش بەهۆی نوسانی پێشەوەی زمان بە پووکەوە.**

---

[٨٣] **هەندێکی تر لەزانایان پێیان وایە لادانی مەخرەجە، هەندێکی تریشیان پێیان وایە لادانی سیفەتە، لەچاپی یەکەمدا منیش بەلادانی مەخرەج پێناسەمکردبوو بەلام پاش توێژینەوە گەڕانەوە بۆسەرچاوەکان بۆم دەرکەوت کە ڕای یەکەم بەهێزترەو، زۆرێك لە توێژەران پەسەندیان کردووە. بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١٠٣، الجامع الکبیر في علم التجوید: (٢/١٣٤–١٣٥)**

**پیتی (ر)یش پێچەوانەی پیتی (ل) دەنگەکەی لەهەردوو لای پێشەوەی زمانەوە لادەدات بۆ ناوەڕاستی.**

**(ابن الجزري)یش دەڵێت:**

........................ ........ والإنحرافُ صُحِّحَا

فى اللام والرا .......... ............................

**تێبینی: سیفەتی لادان لەپیتی (ل)دا زیاترە لەپیتی(ر)، هەروەها لادانی پیتەکە لە حاڵەتی (شدة)دا زیاترە لە حاڵەتی زەنندەو، لە حاڵەتی زەنندەشدا زیاترە لە حاڵەتی بزوتن (حركة).**

**سیفەتی پێنجەم: (التَّفشّي)**

**لە زمانەوانیدا: بڵاوبوونەوەو فراوانبوون.**

**لە زاراوەشدا: بڵاوبوونەوەی هەوا لەناو دەمدا لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا تاوەکو دەگاتە مەخرەجی پیتی (ظ).**

**پیتەکانی: تەنها پیتی (ش)ە.**

**(ابن الجزري)یش گوتوویەتی:**

............................ وَللتَّفَشّي (الشِّينُ) ............ .

**پلەکانی (التفشّي):**

**١- ئەگەر (شدَّة)داربوو، وەك: (الشَّيطان)، (الشَّاكرين).**

**٢- ئەگەر زەنندەداربوو، وەك: (الرُّشْد)، ( اشْتَرى).**

**٣- ئەگەر بزواو بوو، وەك: (يَغشَى)، (يخشَى).**[٨٤]

---

[٨٤] بڕوانە: تيسير الرحمن ل ٩٣، الجامع الكبير في علم التجويد: (١٤٤/٢).




**سیفەتی شەشەم: (التَّكرير)**

**لە زمانەوانیدا: دووبارە بوونەوە.**

**لە زاراوەشدا: لەرینەوەی سەر زمان لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا.**

**پیتەکانی: تەنها پیتی (ر)یە.**

**(ابن الجزري)یش دەڵێت:**

........وَالرَّا، وَبِتَكْرِيرٍ جُعِلْ ............................

**مەبەستیش لە باسکردنی ئەم سیفەتە خۆ پاراستن و دوور کەوتنەوەیە لێی نەك جێبەجێکردنی، ئەمەش ئەوە ناگەیەنی کەخوێنەر بەتەواوی زمانی لەجووڵە بخات بەڵکو پێویستە سەری زمانی وبەشێك لەپشتەوەی بەتوندی بنوسێنیٚ بە پووکی بڕەڕی سەرەوە لەگەلٚ هێشتنەوەی بۆشاییەکی زۆر تەسك بۆ چوونەدەرەوەی بەشێك**

لــەدەنگی پیتەکــە، چــونکە پیتــی (ر) پیتێکــی مامناوەنــدە لــەنێوان هەردووسیفەتی (الشدَّة)و (الرِّخاوة)دا.

پلەکانی (التّكرير)

١- ئەگەر (شدَّة)داربوو، وەك: (الرَّحمن الرَّحيم)

بۆیە (ابن الجزري) دەڵێت:

........................ وَأَخْفِ تَكْرِيراً إِذَا تُشَدَّدُ

واتە: ئەگەر پیتی (ر) (شدّة)داربوو (تكرير)ەکەی بشارەوە.

چــونکە پیتــی (مشــدّد) دوو پیتــەو (تكريــر)ی زیــاترەو پێویســتە زیادەڕەوی تێدا نەکرێت.

٢- ئەگەر زەننەداربوو، وەك: ( يرْجون)

١- ئەگەر بزواو بوو، وەك: (نَرَى).[٨٥]

سیفەتی حەوتەم: الإستطالة

لەزمانەوانیدا: درێژ کردنەوە.

لەزاراوەشــدا: درێــژ کردنــەوەی مــەخرەج لەســەرەتای قــەراخی لایــەکی زمانەوە (یان هەردوولای) تا کۆتایی.

پیتەکانی: تەنها پیتی (ض) دە.

پێشەوا (ابن الجزري)یش دەڵێت:

والضَّاد باستطالة ومخْرَج مَيِّزْ من الظَّاء ... ...

---

[٨٥] بڕوانە : الجامع الكبير في علم التجويد: (١٤٠/٢).

**پلەکانی (الإستطالة):**

**بەهێزترینــە ئەگــەر (مشـدّد) بـوو پاشـان ئەگـەر زەنـنـەداربوو پاشـانیش ئەگەر بزواو(متحرك)بوو.**[86]




[86] سەرچاوەی پێشوو (١٤٨/٢).

**پاشماوە: زۆرێك لەپێشەوایانی ئەم زانستە دوو سیفەتی تریان بۆ سیفەتە هەمیشەییە بێدژەکان زیاد کردووە، کە بریتین لە سیفەتی (الخفاء) و(الغنّة)،[87] بۆیە بەگرنگی دەزانم لێرەدا باسێکیان لێوە بکەم:**

**سیفەتی یەکەم: شاراوەیی (الخَفاء)**

**(الخفاء) لەزمانەوانیدا: شاراوەیی**

**لەزاراوەشدا: شاراوەیی دەنگی پیتەکە لەکاتی دەربڕینیدا.**

**پیتەکانی: (هـ، پیتەکانی مەدد)، کەلەوشەی (هاوي)دا کۆبوونەتەوە.**

**(السَّمنودي) دەڵێت:**

وَ(الهَاءُ مَعْ حُرُوفِ مَدٍّ) لِلْخَفَا ........................

**هۆی ناونانی: لەبەر شاراوەییان لەکاتی دەربڕیندا.**

**هۆی شاراوەیی (الخفاء) لەم پیتانەدا:**

**یەکەم: پیتی (هـ):**

**لەبەر لاوازی سەرجەم سیفەتەکانی و، دووری مەخرەجەکەی بۆیە پێویستە قورئانخوێن بەئاگاداری (تحفُّظ)ەوە ئەم پیتە دەربڕێت.**

**چۆنێتی چارەسەرکردنی:**

**ئەگەر زەنندداربوو: دەربڕینی (هـ)ی زەننەدار قورسترە لەدەربڕینی (هـ)ی بزواو، بۆیە چارەسەرکردنی بە تەسککردنەوەی مەخرەجەکەی وئاشکراکردنی سیفەتەکانی دەبێت بەتایبەت هەردوو سیفەتی**

---

[87] بڕوانە: نهاية القول المفيد ل ٨٦-٨٧، الروضة الندية شرح متن الجزرية ل ٢٨- ٢٩.

**(الهمس)و (الرِّخاوة) واتە: لەکاتی دەربڕیندا نیوەی هەواو نیوەکەی تریشی دەنگ بێت.**
**ئەگەر بزواو بوو: پێویستە لەکاتی دەربڕینیدا پەلەی تێدا نەکرێت و درێژیش نەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر ڕاناو (ضمیر)بوو بە مەددی (صلة)ی بچووك یان گەورە درێژدەکرێتەوە.**[88]

**دووەم: پیتەکانی مەدد:**
**چونکە مەخرەجیان مەزەندەکراو (مُقَدَّر)ەو لەشوێنێکی دیاریکراوەوە دەرناچن بەڵکو پیتی هەواییِن و لەگەڵ هەوای بۆشایی (جوف)دا دێنە دەرەوەو دەنگیان لەگەڵ هەوادا دەشارێتەوە لەبە فراوانی مەخرەجەکەیان.**

**چارەسەری شاراوەیی (الخفاء)ی پیتەکانی مەدد:**
**بەهێزکردنی ئەم پیتانە ئەویش بەدرێژکردنەوەی دەنگ بۆماوەیەك کەمترینی (٢) جووڵەبێت، چونکە بێ درێژکردنەوەیان مانای وشەکە دەگۆڕێت، وەك: (يقُول) دەبێتە (يَقُل).**
**جاری واش هەیە ماناکە خراپ (فاسد) دەکات، وەك: ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا﴾ دەبێتە (فَسَقَ لَهُمَا)!!**

---

[88] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١٠٥– ١٠٧.

**سیفەتی دووەم: مینگە (الغنة)**

**مینگـە: دەنگێکـی خۆشـە، هاوەڵایـەتی هـەردوو پیتـی (م، ن) دەکـات، بەڵام مینگەی پیتی (م) لەپیتی (ن) زیاترە.**

**خاوەنی (السلسبیل الشافي) دەڵێت:**

وغُنَّةٌ صَوْتٌ لَذيذٌ رُكِّبا     في النُّونِ والمِيمِ عَلَي مَراتِبا

**هەندێ لـەزانایان دەڵێن ئـەم دەنگـە لـەدەنگی ئاسك و، بـۆڕەی مانگـاو، بای نێوگەڵای درەخت دەچێت.**[89]

**پیتەکانی: (ن، م)**

## پلەکانی مینگە:

**قوڕئان خوێنی بەڕێز، لەسـەر ڕای بـەناوبانگ (مشـهور)مینگە دەبێـت بـە پێنج پلەوە:**

**١- تەواوترین: لە نون و میمی(شدّة)داردا:**

**أ- لەیەك وشەدا:**

**﴿إِنَّ﴾، ﴿يَمُنُّونَ﴾، ﴿هَمَّتْ﴾، ﴿وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾.**

**ب- لەدوو وشەدا: ئەمیش چوار جۆرە:**

- **تێهەڵکێشی نونی زەننەدارو (تنوین) لە پیتی نون و میمدا ﴿إِن نَّشَأْ﴾، ﴿مِن مَّالِ اللَّهِ﴾**
- **تێهەڵکێشی پیتی (م) لە (م)دا ﴿كَم مِّن فِئَةٍ﴾.**

[89] بڕوانە: الجامع المفيد في صناعة التجويد للسّنهوري ل ٣٦٧.

- تێهەڵکێشی (متجانسين) پیتی (ب)ی زەننەدار لە (م)دا:
﴿يابُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا﴾
- تێهەڵکێشی لامی (شمسي) لەنوندا ﴿إِلَى النُّورِ﴾، ﴿عَنِ النَّعِيمِ﴾
(ابن الجزري)یش دەڵێت:

وأظْهر الغُنَّة من نُون ومِنْ    ميمٍ إذا ما شُدِّدا ........ .

٢- تەواوتر: لە تێهەڵکێشکردنی ناتەواودا (الإدغام الناقص)،
واتە تێهەڵکێشی نونی زەننەدارو (تنوين) لە پیتی(ي) و(و)دا وەك:
﴿فَمَن يُؤْمِن﴾، ﴿سراجاً وهّاجا﴾

٣- تەواو: لە نون و میمی شاراوە (مُخفی)دا، هەروەها هەڵگەڕاندنەوە (إقلاب )یش دەگرێتەوە:
﴿ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾ (الصّافات٢١)
﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ ﴾ (البقرة ٢٤٦)

٤- ناتەواو: لە نون و میمی زەننەدار و ئاشکرادا .
وەك: ﴿يَنْحِتُون﴾ ، ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ﴾

٥- ناتەواوترین: لە نون و میمی بزواو (متحرك)دا.
﴿يُنَادَوْنَ﴾، ﴿نُودِيَ﴾، ﴿مِنَ السَّمَآءِ مَآءً ...﴾ [٩٠]

---

[٩٠] بڕوانە: تيسير الرحمن في تجويد القرآن ل ١١٠-١١١، هداية القاري للمرصفي ل٩٤-٩٥، الجامع الكبير في علم التجويد:(١٥٢/٢-١٥٦) .

**کەواتــە مینگــە ســیفەتێکی وابەســتەیە بــەپیتی (م)و (ن)ەوە، بــەڵام لەدووشـێوەی کۆتاییـدا دەرناکـەوێت و لەهەرسـێ شـێوەی سـەرەتادا پێویستە دەربخرێـت و ئەنـدازەی دوو جووڵـە (حرکـة) درێـژ بکرێتـەوە، بەڵام لەدوو پلەی کۆتاییدا لەیەك جووڵە (حرکة) زیاتر درێژ ناکرێنەوە.**

**تێبینی:**

**یەکەم: مەبەست لەتەواو و ناتەواوی لەسێ پلەی سەرەتادا:**

**(بــەهێزی مینگەو،تــەواوی پشــت بەســتن بــە (خیشــوم)و، ناتــەوای مینگە)یە.**

**بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن مەبەست پێی درێژکردنەوەی مینگەکانە لەڕووی کـات (زمـن)ەوە، واتـە لەپلـەی یەکەمـدا زیـاتر درێژدەکرێتـەوەو، دووەمیش لەیەکەم کەمترو، سێیەمیش لەدووەم کەمتر.[٩١]**

**دووەم: لـەکاتی دەربڕینـی مینگـەدا دەنگـی پیتەکـە یـان سیفەتەکەی لـە کەپوو (خیشوم)ەوە دەردەچێت، نەك پیتەکە خۆی.**

**سێیەم: مینگەی پیتی (ن) بەهێزترە لەمینگەی پیتی (م).[٩٢]**

---

[٩١] **بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١١١، فتح رب البریة شرح المقدمة الجزریة : ل ٣٠.**

[٩٢] **بڕوانە: نهایة القول المفید ل ٨٧.**

**گەورەکردن و بچووککردنی مینگە:**

**مینگە شوێنی پیتی پاش خۆی دەکەوێت، واتە: گەورە دەکرێت ئەگەر بەدوای نونی زەننەدارو(تنوین)دا یەکێك لەپیتەکانی (إستعلاء) هاتبوو، ئەمەش لەحاڵەتی شاردنەوە (إخفاء)دا دەبێت کاتێك دەگات بە هەر پێنج پیتی (ص، ض، ط، ظ، ق).**

**خاوەنی (التحفة) دەڵێت:**

............. وَتَتْبَعُ الأَلِفْ مَا قَبْلَهَا ، وَالْعَكْسُ فِي الْغَنِّ أُلِفْ

**هەروەها خاوەنی (السلسبيل الشافي)یش دەڵێت:**

وفخِّم الغُنَّة إن تلاها حروفُ الاستعلاءِ لا سواها

**نموونە:**

﴿ يُنصَرُون، مِن صَلْصَالٍ، ريحاً صرصرا، مَنضُود، لَمن ضرُّه، وكلّاً ضربْنا، ينطقون، مِن طِين، حلالاً طيّبا، يَنظُرُون، إن ظنًّا، ظلّاً ظليلاً، يَنقَلِبون، مِن قَبْلِ، عليمٌ قدير﴾ [93]

**بەڵام ئەگەر بەدوای نونی زەننەدارو (تنوین)دا پیتەکانی تری (إخفاء) هاتن ئەوا مینگەیان بچووك دەکرێتەوە، وەك:**

﴿ الإِنسَان، كُنتُم، مِن شَيء، أنفَقتُم ﴾

[93] **بڕوانە: مذكرة في التجويد (١١/٢)، نهاية القول المفيد ل ١٥٨-١٥٩.**

# پیت و سیفەتە بەهێزو لاوازەکان

**سیفەتە لازمەکان لەڕووی بەهێزی و لاوازیەوە دەکرێن بە سێ بەشەوە :**

**١- سیفەتە بەهێزەکان: (١١) سیفەتن:**

**( الجهـــر )و ( الشِــدّة )و ( الإســتعلاء )و ( الإطبــاق )و (الصـــفير )و ( القلقلـة )و ( الإنحـراف )و ( التكريـر )و ( التفشّـي )و ( الإسـتطالة )و ( الغنّة ).**

**٢- سیفەتە لاوازەکان: (٦) سیفەتن:**

**(الهمـــس)و (الرخـــاوة)و (الإســـتفال)و ( الإنفتـــاح)و (اللـــين)و (الخفاء).**

**٣- ســیفەتی بــەهێزو لاوازیــان تێدانیــە: ( الإصــمات )و ( الإذلاق )و (البينيّة) [واتە: نێوان ( الشدّة )و ( الرِّخاوة ) ]**

**هەروەها پیتەکانیش دەکرێن بەپێنج بەشەوە:**

**١- بەهێزترین: (١) پیت: (ط) چونکە هەموو سیفەتەکانی بەهێزن.**

**٢- بەهێز: (٨) پیت: (ب، ج، د، ص، ض، ظ، ق) چونکە سیفەتە بەهێزەکانی لەلاوازەکانی زیاترە.**

**٣- مامناوەند: (٥) پیت: (ء، غ، ل، م، ن)، چونکە سیفەتە بەهێزو لاوازەکانی یەکسانە.**

**٤- لاواز: (١٠) پیت: ( ت، خ، ذ، ز، س، ش، ع، ك، هەردوو پیتی (اللين): و، ي) چونکە سیفەتی لاوازیان زیاترە.**

٥- لاوازترین: (٧) پیت:

(٤)پیتیان: ( ث، ح، ف، هـ )هەموو سیفەتەکانیان لاوازە، لەهەمووشیان لاوازتر پیتی (هـ) لەبەر سیفەتی (الخفاء).

(٣) پیتیشان: (ا، و، ي) واتە پیتەکانی مەدد، تەنها یەك سیفەتی بەهێزیان تێدایە، ئەویش سیفەتی (الجهر).[٩٤]

---

[٩٤] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١١٧- ١١٨.

خوێنەری بەڕێز! سەبارەت بەدیاریکردنی سیفەت وپیتە بەهێزو لاوازەکان چەند ڕاوبۆچونێکی تریش هەیە، بەڵام ئەمەی کەباسمانکرد بەهێزترینیانە، خوای گەورەش زاناترە.

بۆزیاتر شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

نهاية القول المفيد ل ٩١- ٩٣، حق التلاوة: ٣٣٨- ٣٣٩، الجامع الكبير (٢/١٩٥- ٢٠١)

## خشتەی سیفەتی پیتەکان

| پیتەکان | سیـــفەتـەکـان ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | پلەی پیتەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| الهمزة | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | مامناوەند |
| الباء | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مذلق | مقلقل | | بەهێز |
| التاء | مهموس | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الثاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاوازترین |
| الجيم | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الحاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاوازترین |
| الخاء | مهموس | رخوي | مستعل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الدال | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الذال | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الراء | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مذلق | منحرف | مكرّر | بەهێز |
| الزاي | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | صفيري | | لاواز |
| السين | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | صفيري | | لاواز |
| الشين | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | متفشٍ | | لاواز |
| الصاد | مهموس | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | صفيري | | بەهێز |
| الضاد | جهري | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | مستطيل | | بەهێز |
| الطاء | جهري | شديد | مستعل | مطبق | مصمت | مقلقل | | بەهێزترین |
| الظاء | جهري | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | | | بەهێز |
| العين | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الغين | جهري | رخوي | مستعل | منفتح | مصمت | | | مامناوەند |
| الفاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاوازترین |
| القاف | جهري | شديد | مستعل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الكاف | مهموس | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| اللام | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مذلق | منحرف | | مامناوەند |
| الميم | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مذلق | غنّة | | مامناوەند |

| پیتەکان | سیـــفەتـــەکـــان | | | | | | | پلەی پیتەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | |
| النون | جهري | متوسط | مستفل | منفتح | مذلق | غنّة | | مامناوەند |
| الهاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | خفاء | | لاوازترین |
| (و)ی بزواو | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| (ي)ی بزواو | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| پیتی مەدد | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | خفاء | | لاوازترین |
| پیتی لین (و،ی) | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | لين | | لاواز |

# تەواوکردنی جووڵەکان (إتمامُ الحركات)

**پێویستە لەسەر قورئان خوێن:**
**– لەکاتی دەربڕینی پیتێکی سەردار (مفتوح)دا دەمی بکاتەوە وەك کردنەوەی لەکاتی دەربڕینی پیتی ئەلیفدا.**
**– لەکاتی دەربڕینی پیتێکی بۆردار (مضموم)یشدا هەردوولێوی خڕکاتەوە وەك خڕکردنەوەی لەکاتی دەربڕینی پیتی واودا.**
**– لەکاتی دەربڕینی پیتی ژێردار (مكسور)یشدا شەویلگەی خوارەوەی دابەزێنێ وەك دابەزاندنی لەکاتی دەربڕینی پیتی (ي)دا.**
**– بەڵام پیتی زەنندار لەمەخرەجی بنەڕەتی (أصلي) خۆیەوە دەردەچێت بێ ئەوەی هیچ کام لەوانەی سەرەوەی لەگەڵدابێت.[٩٥]**
**خۆ ئەگەر قورئان خوێن ئەمانەی جێبەجێنەکرد ئەوا خوێندنەکەی ناتەواوە، تەنانەت زانای گەورەی وەك (أحمد الطِّيبي) دەڵێت هەڵەی ئەو کەسە لەڕووی واتاوە لە هەڵەی ئاشکرا (اللحن الجليّ) ناشیرینترە، ئەوەتا لە مەتنەکەیدا[٩٦] دەڵێت:**

وَكُلُّ مَضْمُومٍ فَلنْ يَتِمَّا — إِلَّا بِضَمِّ الشَّفَتَيْنِ ضَـمَّا
وَذُو انْخِفَاضٍ بِانْخِفَاضٍ لِلْفَمِ — يَتِمُّ وَالْمَفْتُوحُ بِالْفَتْحِ افْهَـمِ
إِذِ الْحُرُوفُ إِنْ تَكُنْ مُحَرَّكَهْ — يَشْرَكُهَا مَخْرَجُ أَصْلِ الْحَرَكَهْ
أَيْ مَخْرَجُ الْوَاوِ وَمَخْرَجُ الْأَلِفْ — وَالْيَاءُ فِي مَخْرَجِهَا الَّذِي عُرِفْ

---

[٩٥] أطلس التجويد ل ٨٩.
[٩٦] المفيد في علم التجويد ل ٧.

فَإِنْ تَرَ الْقَـارِئَ لَنْ تَنْطَبِقَا		شِفَاهُهُ بِالضَّمِّ كُنْ مُـحَقِّقَا
بِأَنَّهُ مُنْتَقِصٌ مَا ضَــمَّا		وَالْوَاجِبُ النُّطْقُ بِهِ مُتَـمَّا
كَذَاكَ ذُو فَتْحٍ وَذُو كَسْرٍ يَجِبْ		إِتْمَامُ كُلٍّ مِنْهُمَا افْهَمْهُ تُصِبْ
فَالنَّقْصُ فِي هَذَا لَدَى التَّأَمُّلِ		أَقْبَحُ فِي الْمَعْنَى مِنَ اللَّحْنِ الْجَلِي
إِذْ هُوَ تَغْيِيرٌ لِذَاتِ الْحَرْفِ		وَاللَّحْنُ تَغْيِيرٌ لَهُ بِالْوَصْـفِ

# بەشی پێنجەم

# سیفەتە کاتیەکان ( الصفات العرضية )

**سیفەتە کاتیەکان ( الصفات العارضة): ئەو سیفەتانەن کە تەواوکەری پیتەکەن و لەهەندێ حاڵەتی دیاریکراودا تووشی پیت دەبن و لەهەندێ حاڵەتیشدا لەبەر هۆکارێ لەهۆکارەکان لێی جیادەبنەوەو، ژمارەشیان یازدە سیفەتە، لەم بەشەدا باسیان لێوە دەکەین.**

**ئەمەش سیفەتەکانن:**

**(الإظهار)و ( الإدغام)و (الإخفاء)و (الإقلاب)و (الترقيق)و (التفخيم)و (المدّ)و ( القصر)و (التحريك)و (الإسكان)و (السَكت).[97]**

**العلاّمة (السمّنودي) لەبارەیانەوە دەڵێت:[98]**

إِظْهَارٌ ادْغَامٌ وَقَلْبٌ وَكَذَا　　　إِخْفَا وَتَفْخِيمٌ وَرِقٌّ أُخِـذَا
وَالمَدُّ وَالقَصْرُ مَعَ التَّحَرُّكِ　　　وَأَيضًا السُّكُونُ وَالسَّكْتُ حُكِي

---

[97] بڕوانە: حق التلاوة ل ٢١٣و٢٣٨

[98] لآلئ البيان في تجويد القرآن: إبراهيم على شحاتة السمنودي ل ٤.

## گەورە كردن و بچووككردن (التفخيم والترقيق)

**گــەورەكردن (التفخــيم): لــەزاراوەدا قەڵەويەكــە دەچــێتە نــاو لەشــى پيتەكەوە، واتە: ناوى دەم پڕدەكات لەدەنگى ئەوپيتە.[٩٩]**

**پيتەكانى زمانى عەرەبى لەڕووى گەورەو بچووكى (تفخيم و ترقيق)ەوە دەكرێن بەسێ بەشەوە:**

**١- ئەو پيتانەى هەميشە بەگەورەيى (مفخّم) دەخوێنرێنەوە.**

**٢- ئەو پيتانەى هەميشە بەبچووكى (مرقَّق) دەخوێنرێنەوە.**

**٣- ئــەو پيتانــەى هەنــدێ جــار بەگــەورەيىو، هەنــدێ جــاريش بەبچووكى دەخوێنرێنەوە.**

### يەكەم: ئەو پيتانەى هەميشە بەگەورەيى دەخوێنرێنەوە:

**ئەو پيتانەى هەميشە بەگەورەيى دخوێنرێنەوە بريتين لە (٧) پيتەكەى (إستعلاء: خص ضغط قظ)، لەنێويشياندا پيتەكانى (إطباق) سيفەتى گەورەكردنيان زياترە (ص، ض، ط، ظ)**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

وَحَرْفَ الاسْتِعْلاَءِ فَخِّمْ وَاخْصُصَا        الاطْبَاقَ أَقْوَى نَحْوَ قَالَ وَالْعَصَا

**بەڵام بەشێوەيەكى گشتى ڕيزبەندييان- لەگەورەترينەوە- بەم شێوەيە دەبێت: (ط، ض، ص، ظ، ق، غ، خ)[١٠٠]**

---

[٩٩] بڕوانە: نهاية القول المفيد ل ١٢٧.

[١٠٠] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل ١٤٩.

## پلەکانی پیتەکانی (الإستعلاء)[101]

**سەبارەت بەپلەی هەر یەکێك لەم پیتانە زانایان دوو بۆچوونیان هەیە:**

## بۆچوونی یەکەم:

**بۆچوونی(ابن الطحان الأندلسي)یە کە دەڵێت هەر یەکێك لەم پیتانە سێ پلەیان هەیە:**

**پلەی یەکەم: گەورەترینیانە، ئەگەر سەر (فتحة) دار بوون.**

**وەك: ﴿ طَالوت، الضَّالون، صَاحبُكم، الظَّالمون، قَال، خَلا، ظَلَم ﴾**

**پلەی دووەم: ئەگەر بۆر (ضمّة) دار بوون.**

**وەك: ﴿ طُوبى، يقُول، لا تَخُونوا ﴾**

**پلەی سێیەم: ئەگەر ژێر(كسرة) دار بوون.**

**وەك: ﴿ طِبتم، قِيل، خِزي﴾**

**بەڵام ئەگەر زەننە (سكون)ی هەبوو، سەیری پیتی پێشەوەی دەکرێت، ئەگەر:**

- **پیتی پێشەوەی سەر (فتحة)ی هەبوو، ئەوە لەپلەی یەکەمدایە.**
  **وەك: ﴿ أَيَطمع، أَضْغاث، أَصْلابكم، أَظْلم، يَغْلِب، مَقْرَبَة، أَخْرجكم ﴾**
- **پیتی پێشەوەی بۆر (ضمة)ی هەبوو لەپلەی دووەمدایە.**
  **وەك: ﴿ لِيُطْفئوا، يُصْرف، مُظْلمون، أن تُقْبل، يُغْفر﴾**

---

[101] بڕوانە: النشر في القراءات العشر لابن الجزري (٢٤٦/١)، فتح رب البرية ل ١١، الجامع الكبير في فن التجويد (١٦٩/٢– ١٧١).

- پیتی پێشەوەی ژێر (كسرة)ی هەبوو لەپلەی سێیەمدایە.

وەك: ﴿ إِطْعام، إِضْرِبْ، أفرِغْ، شِقْوتُنا، إِخْراجاً ﴾

## بۆچوونی دووەم:

هەر یەكێك لەم پیتانە پێنج پلەیان هەیە، ئەم بۆچوونەش پەسەندكراوە لەلای (ابن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ:

**پلەی یەكەم**: گەورەترینیانە، ئەگەر سەر (فتحة) یان هەبێ و بەدوایاندا پیتی ئەلیف هاتبێ. وەك:

﴿ طَابَ، ضَاقَ، صَابِراً، يُظَاهِرُونَ، يُقَاتِلُونَ، غَآئِبِينَ، خَآئِبِينَ﴾

**پلەی دووەم**: ئەگەر سەر (فتحة)یان ببێ و بەدوایاندا پیتی ئەلیف (الألف) نەهاتبێ.

وەك: ﴿ طَبَعَ، ضَرَبَ، صَدَقَ، ظَلَّ، قَتَلَ، غَفَر، خَلَقَ ﴾

**پلەی سێ یەم**: ئەگەر بۆر (ضمة) یان هەبێت.

وەك: ﴿ طُبِعَ، صُرِفَتْ، ضُرِبَتْ، يَظُنُّونَ، قُتِلَ، غُلِبَت، خُلِقَتْ ﴾

**پلەی چوارەم**: ئەگەر زەننەدار (ساكن) بوو .

وەك: ﴿ يَطْبَعُ، يَضْرِبُ، أَصْبَرَهُمْ، يَظْلِم، يَقْتُلْ، يَغْلِبْ، يَخْلُقُ﴾

**پلەی پێنجەم**: ئەگەر ژێر (كسرة) یان هەبوو.

وەك: ﴿ طِبَاقاً، ضِرَاراً، صِرَاطاً، ظِلاًّ، قِتَالاً، غِشَاوَةٌ، خِفَافاً ﴾

(العلاّمة المُتَولّي) بەهۆنراوە باسی هەردوو بۆچوونەکەی کردووە:[١٠٢]

بۆچوونی یەکەم:

ثُمَّ الْمُفَخَّمَاتُ عَنْهُمْ آتِيَهْ عَلَى مَرَاتِبٍ ثَلاَثٍ ، وَهِيَهْ:
مَفْتُوحُهَا،مَضْمُومُهَا،مَكْسُورُهَا وَتَابِعٌ مَا قَبْلَهُ سَاكِنُـهَا
فَمَا أَتَى مِنْ قَبْلِهِ مِنْ حَرَكَهْ فَافْرِضْهُ مُشْكَلاً بِتِلْكَ الْحَرَكَهْ

بۆچوونی دووەم:

وَقِيلَ:بَلْ مَفْتُوحُهَا مَعَ الأَلِفْ وَبَعْدَهُ الْمَفْتُوحُ مِنْ دُونِ أَلِفْ
مَضْمُومُهَا،سَاكِنُهَا، مَكْسُورُهَا فَهَذِهِ خَمْسٌ أَتَاكَ ذِكْرُهَا
فَهْيَ وَإِنْ تَكُنْ بِأَدْنَى مَنْزِلَهْ فَخِيمَةٌ قَطْعاً مِنَ الْمُسْتَفِلَهْ
فَلاَ يُقَالُ إِنَّهَا رَقِيقَهْ كَضِدِّهَا، تِلْكَ هِيَ الْحَقِيقَهْ

تێبینی:

١- ئەگەر پیتی (خ)ی زەنندار پێشەوەی (کسرة) بوو، بەڵام بەدوایدا پیتی (ر)ی گەورە هاتبوو، پێویستە پیتی (خ) بەوپەڕی گەورەییەوە بخوێنرێتەوە لەبەر پیتی (ر)[١٠٣]

وەك: ﴿وَيُخۡرِجُكُمۡ إِخۡرَاجٗا﴾ (نوح:١٨) ﴿وَقَالَتِ ٱخۡرُجۡ عَلَيۡهِنَّ﴾ (يوسف:٣١)

(العلامة المتولي) دەڵێت:[١٠٤]

وخاءُ إخراج بتفخيمٍ أتت من أجل راءٍ بعدها إذْ فُخِّمتْ

[١٠٢] فتح رب البرية ل ١٢.
[١٠٣] بڕوانە: الجامع الكبير في فن التجويد (١٧٣/٢).
[١٠٤] هداية القاري إلى تجويد كلام الباري ل ٦٠.

## دووەم: ئەو پیتانەی کە هەمیشە بە بەبچووکی دەخوێنرێنەوە

هـەموو پیتـەکانی (إسـتفال) بەبچـووکی دەخوێنرێنـەوە جگـە لـە پیتـی ئەلیف و، لامی وشەی پیرۆزی (اللّٰه)و، پیتی (ر).

واتە :(ء، ب، ت، ث، ج، ح، د، ذ، ز، س، ش، ع، ف، ك، م، ن، ه، و، ي)

(ابن الجزري) دەڵێت:

فَرَقِّقَنْ مُسْتَفِلًا مِنْ أَحْرُفِ ........................

## سێیەم: ئەوپیتانەی هەندێ جار بەگەورە و هەندێ جاریش بە بچووك دەخوێنرێنەوە.

ئەمانەن:

ئەلیف و، پیتی (ر)و، لامی وشەی پیرۆزی (اللّٰه) و، پشت بەخوای گەورە لێرەدا باسیان دەکەین:

## پیتی (ر)

پیتی (ر) سێ حاڵەتی هەیە چونکە جاری واهەیە بەگەورەو جاری واش هەیە بەبچووك و جاری واش هەیە بەهەردوو حاڵەتەکە دەخوێنرێتەوە:

**یەکەم: پیتی (ر) لەحاڵەتی گەورەیی ( تفخیم)دا:**[105]

١- ئەگەر خۆی سەر (فتحة) ی هەبوو.

وەك: ﴿ رَحمَتِ رَبّك، أَرَءَيتَ، أَلَم تَرَ إِلى رَبِّك، يَرَونه، تَفرَحون ﴾

٢- ئەگەر خۆی زەنندار بێ و پیتی پێشەوەی سەر (فتحة) ی هەبێ.

وەك: ﴿ أَرْسَلنَا، أَرْبَعِين، مَرْجِعِكُم، مَرْيَم، لا تَذَرْ ﴾

٣- ئەگەر خۆی بەهۆی وەستانەوە زەنندەی هەبوو، هەروەها پیتی پێشتریش زەنندەی هەبوو- بەمەرجێك پیتی (ي) نەبێت- و پیتی پێش ئەویش سەر(فتحة)ی هەبێ، یان پیتە زەنندارەکە ئەلیف بێت: ﴿وَالْفَجْرِ، القَدْرِ، النَّار، القرَار ﴾

٤- ئەگەر بۆر (ضمة) ی هەبوو.

وەك: ﴿ كَفَرُواْ، الرُّعب، رُوحُ القُدُس، سَنَفرُغ، تَعرُج ﴾

٥- ئەگەر خۆی زەنندار بێ و پیتی پێشەوەی بۆر (ضمة) ی هەبێ.

وەك: ﴿ المُرْسَلُون، القُرْءَان، بِقُرْبَان، أنِ اشكُرْ، عُرْضة ﴾

---

[105] بڕوانە: تیسیر الرحمن ١٤٦-١٤٨.

٦- ئەگەر خۆی بەهۆی وەستانەوە زەنەی هەبێ و، پیتی پێشتریش زەننەو پێشتریش بۆر (ضمّة)ی هەبێ:

﴿وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ﴾ **الحج:** (٤١)، ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾ **الإنشقاق:** (١٤).

٧- ئەگەر خۆی زەننەدارو لەهەمان وشەدا پیتی پێشەوەی ژێر (کسرة)ی (أصلي) هەبێت بەلاّم پیتی دواوەی یەکێك بێت لەپیتەکانی (إستعلاء: خُصَّ ضَغطٍ قِظ) بەمەرجێك (کسرة)ی نەبێت، ئەمیش تەنها لەم پێنج وشەدا ڕوویداوە:

﴿ قِرطَاس، فِرقَة، وإرصَادا، مِرصَادا، لَبِالمِرصَاد﴾

(ابن الجزري) دەڵێت:

إِنْ لَمْ تَكُنْ مِنْ قَبْلِ حَرْفِ اسْتِعْلاَ ..........................

٨- ئەگەر خۆی زەننەی هەبێ و هەمزەیەکی گەیاندن (الوصل) لەپێشیەوە هاتبێت.

﴿ الذي ارْتضى ﴾، ﴿وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا ﴾

﴿ ارْجِعوا إلى أبيكم ﴾، ﴿ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ ﴾

﴿ أَمِ ارْتَابُوا ﴾، ﴿ إِنِ ارْتَبْتُمْ ﴾

(ابن الجزري) دەڵێت:

...................... أَوْ كَانَتِ الكَسْرَةُ لَيْسَتْ أَصْلاَ

## دووەم: پیتی (ر) لەحاڵەتی بچووکی (مرقَّق)یدا: [106]

١- ئەگەر خۆی ژێری هەبێ.

وەك: ﴿ تَجْرِي، رِزْقاً، جِبْرِيل، رِجال، رِحلة، زَكرِيَّا ﴾

(ابن الجزري) دەڵێت:

وَرَقِّقِ الرَّاءَ إِذَا مَا كُسِرَتْ ..........................

٢- ئەگەر خۆی زەننەی هەبێ و پیتی پێشەوەی ژێر (كسرة)ی (أصلي) بێ و لەیەك وشەدا بێت، وە لە دوایەوە پیتێك لەپیتەكانی ( استعلاء ) نەبێ وەكو:

وەك : ﴿ فِرْعَوْن، الفِرْدَوْس، شِرْعَة، مِرْية، وانتَظِرْ، واستَغفِرْ، أشِرّ، صِرّ، ونُقِرّ، ويَقْدِرْ ﴾

(ابن الجزري) دەڵێت:

كَذَاكَ بَعْدَ الْكَسْرِ حَيْثُ سَكَنَتْ ........................

٣- ئەگەر زەننەی هەبوو بەهۆی وەستان (وقف)ەوە وبەدوای پیتێكی زەننەداریشدا هاتبوو جگە لەپیتەكانی (إستعلاء)و پێش پیتە زەننەدارەكەش ژێر (كسرة) هەبێت.

وەكو: ﴿السِّحْرِ، الذِّكْرِ، حِجْر﴾

٤- ئەگەر خۆی زەننەی بەهۆی وەستان (وقف)ەوە هەبێ و لەپاش (ي) یەكی زەننەدارەوە هاتبێت، جائەو (ي)یە پیتی مەدد بێت وەكو:

---

[106] بڕوانە : تیسیر الرحمن ١٤٨-١٤٩.

﴿بَصِيرٌ، قدير ﴾ يان پيتى (لين) بێت، وەكو: ﴿ السَّيْرَ، ذلك خَير ﴾

٥- ئەگەر لەكۆتايى وشەيەكدا زەننەى هەبوو، هەروەها پيتى پێشەوەيى ژێر (كسرة)ى (أصلي) هەبوو وە بە دوايدا لەوشەيەكى تردا پيتێكى (إستعلاء) هاتبوو، ئەم حاڵەتەش سێ جار لەقورئانى پيرۆزدا ڕوويداوە:

﴿وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ﴾ (لقمان١٨)

﴿فَٱصۡبِرۡ صَبۡرًا جَمِيلاً ﴾ (المعارج ٥)

﴿أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ ﴾ (نوح ١)

٦- ئەگەر بەدوايدا پيتێكى لاركراو (مُمال) هەبوو، ئەم حاڵەتەش لەقورئانى پيرۆزدا يەك جار ڕوويداوە، (لە ريوايەتى (حفص)دا):

﴿ وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٖىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآ ﴾ (هود ٤١)

پێشەوا (الشاطبي) دەڵێت:

وَلكِنَّهَا في وَقْفِهِمْ مَعْ غَيْرِهاَ تُرَقِّقُ بَعْدَ الْكَسْرِ أَوْ مَا تَمَيَّلاَ

## سێیەم: پیتی (ر) لەنێوان هەردوو حاڵەتی ( تفخیم)و ( ترقیق)دا [107]

ئەمیش دوو حاڵەتە:

حاڵەتی یەکەم: بەگەورەیی و بەبچووکی دەخوێنرێتەوە بەڵام بچووك باشترە، ئەمیش سێ جۆرە:

١- ئەگەر پیتی (ر) زەنندداربوو بەهۆی وەستانەوەو، بەدوایدا پیتێکی یای سڕاوە (محذوف) هاتبوو، ئەمە لەسێ وشەدا ڕوویداوە:

﴿ ونُذُرِ ﴾ کەلە سوڕەتی (القمر)دا شەش جار هاتووە.

﴿ يَسْرِ ﴾ یەك جار لەسوڕەتی (الفجر: ٤)دا هاتووە.

﴿ أَسْرِ ﴾ پێنج جار هاتووە، سێ جاریان پیتی (ف)ی لەپێشەوەیەو دوو جاریشیان پیتی (و)، ئەمەش ناوی سوڕەت و ژمارەی ئایەتەکانیانە:

(هود:٨١)، (الحجر:٦٥)، (الدخان: ٣٢)، (طه: ٧٧)، (الشعراء: ٥٢)

جا ئەوەی بەباریکی دەیخوێنێتەوە سەیری بنەڕەتی وشەکان دەکات ئەویش پیتی (ي) سڕاوەیە، بۆیە وەستان (وقف) وەکو بەردەوامبوون (وصل) لێدەکات.

ئەو کەسەشی بەگەورەیی دەیخوێنێتەوە سەیری بنەڕەتی وشەکە ناکات، بەڵکو بەپیتێکی زەنندداری کاتی (عارض)ی دادەنێ.

---

[107] بڕوانە: تیسیر الرحمن ١٤٨-١٤٩.

**٢- ئەگـەر خـۆی زەننـەو پـيتی پێشەوەيشـی ژێـری بنـەڕەتی (كسـرٌ أصلي) بێ و گەيشتبێت بە پيتی (إستعلاء) بەمەرجێك ژێردار بێ.**

**ئەم جۆرەش يەكجار لەقورئانی پيرۆزدا ڕوويداوە:**

﴿ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٍ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ (الشعراء : ٦٣)

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

**وَالْخُلْفُ فِي فِرْقٍ لِكَسْرٍ يُوجَدُ** ......................

**٣- ئەگـەر خـۆی زەننـەداربوو بـەهۆی وەسـتانەوەو لـە دوای پيتێكـی زەننـەداری (اسـتعلاء) هـاتبێ و ئـەويش لـە دوای پيتێكـی ژێـردار (مكسور)ەوە هاتبێ.**

**هەروەها ئەم جۆرەش يەكجار لەقورئانی پيرۆزدا ڕوويداوە:**

﴿ وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ ﴾ (سبأ : ١٢)

**جائـەوەی گـەورەی دەكـات سـەيری پيتـە (اسـتعلاء)ەكـە دەكـات و، ئەوەشـی بچـووكی دەكاتـەوە سـەيری پيتـە (اسـتعلاء)ەكـە ناكـات بەڵكو سەيری (كسرة)ی پێش ئەو دەكات.**

**حاڵــــەتی دووەم: بەگـــەورەیی و بەبچـــووکی دەخوێنرێتـــەوە بـــەڵام گەورەکردن باشترە لە کاتی وەستان (وقف)دا:**

**ئەگەر خۆی زەننەی هەبوو بەهۆی وەستانەوە، بەڵام بە دوای پیتێکی زەننــەداری (استعلاء)دا هـاتبێ و ئـەویش بـە دوای پیتێکـی ژێـردار هاتبێ.**

**ئەمەش تەنها لەیەك وشەدا ڕوویداوە:**

﴿ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ﴾ (يوسف ٩٩)

**(المتولي)دەڵێت:**

واختِيرَ أَنْ يُوقَفَ مثلَ الوَصلِ          في راءِ مصرَ القطرَ يَا ذَا الفَضلِ

# پیتی (ل)

**پیتی (ل) لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بەگەورەیی دەخوێنرێتەوە:**

**١- لامی وشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر سەر (فتحة) یان بۆر (ضمة) لەپێشیەوە هاتبوو.**

**وەك :** ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ (الإخلاص: ١) ، ﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴾ (الهمزة: ٦)

**٢- لامی وشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر لەسەرەتاوە هاتبوو.**

**چونکە هەمزەی (وصل) لەسەرەتاوە (مفتوح) دەبێت.**

**وەك:** ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ...﴾ (البقرة ٢٥٧)

**(ابن الجزري) دەڵێت :**

وفَخِّمِ اللاَّمَ من اسْمِ الله عن فتْحٍ أو ضَمٍّ كَعَبْدُ الله

**لەم حاڵەتانەی خوارەوەشدا بەبچووکی دەخوێنرێتەوە:**

**١- لامی وشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر ژێری بنەڕەتی (كسر أصلي) یان کاتی (عارض)ی لەپێشەوە بوو، وەکو:**

﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ ﴾ (الأنفال ١٠)

﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ (الزمر ٤٦)

﴿ لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا ۙ ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ ﴾ (الأعراف ١٦٤)

**چونکە (قَوْماً اللّهُ) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: (قَوْمَنِ اللّه).**[١٠٨]

---

[١٠٨] بڕوانە: مذ كرة في التجويد: (١٠/٢).

**٢- ئەگـەر  پیتێکـی زەننـەدار (سـاکن)ی لەپێشـەوە بـوو، پـێش پیتـە زەنەدارەکەش پیتێکی ژێردار (مکسور) هاتبوو.**

**وەك:** ﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ﴾

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾

## پیتی (الألف)

**پیتــی (الألــف) نەبــە گــەورەکردن (التفخــیم) وەســف دەکرێــت و نەبەبچووککردن (الترقیق)، بەڵکو پێش پیتی خۆی دەکەوێ لەکاتی خوێندنەوەدا.**

**خاوەنی (لآلیء البیان) دەڵێت:**[109]

.........وتتبعُ ما قَبلَها الألِفْ          والعكس في الغنِّ أُلِفْ

**واتە :ئەگەر لە پێشیەوە پیتێکی بەرز (استعلاء) هاتبوو ئەوا بە گەورەیی دەخوێنرێتەوە وەکو:**

﴿خَالدين، الصَّالِحِين، الضَّالِين، الغَالِبون، طَالوت، قَالَ، الظَّالِمون﴾

**هەروەها پیتی ئەلیف بەگەورەیی دەخوێنرێتەوە ئەگەر پیتی (ر) لەپێشیەوە هاتبوو:** ﴿ صِراط، وَرَائِهِم ﴾

**لەوشەی پیرۆزی ﴿الله﴾یشدا بەهەمان شێوە.**

**وەئەگەریش لەپێشیەوە پیتێکی نزم (إستفال) هاتبوو ئەوا بە بچووکی دەخوێنرێتەوە.**

﴿الأسباط، التَّائبون، ثَانِيَ اثنَينِ، جَاءَ، الحَامدون، الدَّار، والذَّاريَات، زَاهق، سَاق، شَاءَ، العَالَمِين، الفَائِزون، كَانَ، اللَّاتِي، المَال، والنَّاهون، هَارٍ، وَاحِد، إليَاس ﴾

**(ابن الجزري) بەم شێوەیە ئاماژەی پێکردووە:**

......................          وَحَاذِرَنْ تَفْخِيمَ لَفْظِ الأَلِفِ

---

[109] **بڕوانە: هداية القاري إلى تجويد كلام الباري ل٩٧.**

# تێهەڵكێشكردن ( الإدغام )

**تێهەڵكێشكردن: بەشێوەیەكی گشتی بریتیە لەخوێندنەوەی دوو پیت بە پیتێكی (شدّة) دار لەكاتی دەربڕیندا.**

**بەشەكانی تێهەڵكێش ( إدغام ) كردن:**

**تێهەڵكێشكردن دەكرێت بەدوو بەشی سەرەكی یەوە:**

**یەكەم: تێهەڵكێشی گەورە: تێهەڵكێشكردنی پیتێكی بزواو (متحرّك) لە پیتێكی بزواوی تردا، بە شێوەیەك كە ببنە پیتێكی (شدّة)دار.**

**هـۆی ناونـانی: چـونكە كـاری زۆری پێویسـتە، یەكـەمیان زەننـەدار (إسـكان)كردنی پیتـی جـوولاو (متحـرك)ی یەكـەم و، دووەمـیش تێهەڵكێش (إدغام)كردنی لەپیتی دووەمدا.[110]**

**ئەم جۆرە تێهەڵكێشەش لە ڕیوایەتی (حفص)دا لەجۆری لێكچووەكان (المتماثلین)ەو لەشەش شوێنی قوڕئانی پیرۆزدا ڕوویداوە:**

١- ﴿...فَنِعِمَّا هِيَ ۖ﴾ (البقرة:٢٧١) **لە بنەڕەتدا (فنعمَ مَا) بووە.**

٢- ﴿نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ﴾ (النساء: ٥٨).

---

[110] **(الإدغام الكبیر) لەزۆربەی سەرچاوەكاندا بەو تێهەڵكێش (إدغام)ە دەوترێ لەنێوان دوو پیتدا دەبێت كەهەردووكیان بزواو (متحرك)ن [پیتەكان یان لێكچوو (متماثلین)ن یان لێك نزیك (متقاربین)ن] و، ئەم تێهەڵكێش (إدغام)ە تایبەتە بە ڕیوایەتی (السوسي) لە (أبو عمرو البصري)ەوە، لەهەندێ شوێندا (حمزة)ش لە گەڵیدا بەشدارە ...**

**بۆیە پێ ی دەوترێ گەورە (الكبیر) لەبەر زۆر دووبارەبوونەوەی (لكثرة وروده) بە پێچەوانەی تێهەڵكێشی بچووك (الإدغام الصغیر)ەوە كە كەمتر دووبارە دەبێتەوە. ( د. دیاری أحمد )**

٣- ﴿قَالَ أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّي ...﴾ (الأنعام: ٨٠) **له بنەڕەتدا (أتحاجِجُونَنِي) بووە.**

٤- ﴿...لَا تَأۡمَ۬نَّا..﴾ (يوسف: ١١) **له بنەڕەتدا (تأمنُنَا) بووە.**

٥- ﴿قَالَ مَا مَكَّنِّي...﴾ (الكهف:٩٥) **له بنەڕەتدا (مكّنَنِي) بووە.**

٦- ﴿ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ ﴾ (الزمر : ٦٤) **له بنەڕەتدا (تأمرونَنِي) بووە.**[١١١]

**دووەم: تێهەڵكێشی بچووك: بریتی یە لە تێهەڵكێشكردنی پیتێكی زەنندار لەگەڵ پیتێكی بزواو (متحرك)دا بەشێوەیەك كەهەردووكیان پیتێكی (شدّة)دار لەڕەگەزی پیتی دووەم دروست بكەن.**

**ئەویش سێ جۆری هەیە:**

**١- تێهەڵكێشی پیتە لێكچووەكان (إدغام المتماثلين).**

**٢- تێهەڵكێشی پیتە هاوڕەگەزەكان ( إدغام المتجانسين).**

**٣- تێهەڵكێشی پیتە لەیەك نزیكەكان ( إدغام المتقاربين).**

[١١١] **بڕوانە: حق التلاوة ل٢٤٠.**

**١- تێهەڵکێشی پیتە لێکچووەکان (إدغام المتماثلین):**

**بریتـی یـە لـەو تێهەڵکێشـەی کـە ڕوو دەدات لـەنێوان دوو پیتـی لێکچـوو لەمەخرەج و لەسیفەتدا،جا هەردوو پیتەکە لەیەك وشـەدا کۆ ببنـەوە یـا لە دوو وشەدا.**

**ئەم تێهەڵکێشەش دەبێت بەدوو بەشەوە:**

**أ- مینگەدار، ئەویش تەنها لە پیتی (ن) و (م)دا:**

- ﴿لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ﴾ (البقرة ٦١)

- ﴿قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ (یونس ٥٧)

**ب- بێمینگە، ئەویش لەم پیتانەی خوارەوەدا:**

- **پیتی (ب) لە (ب)دا:** ﴿ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا﴾ (النمل ٢٨)

**بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: اِذهبِّکتابي.**

- **پیتی (ت) لە (ت)دا:** ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ﴾(البقرة ١٦)

**بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: فَمَا رَبِحَتِّجرتُهُم.**

- **پیتی (د) لە (د)دا:** ﴿وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ﴾ (المائدة ٦١)

- **پیتی ( ذ ) لە ( ذ )دا:** ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا﴾ (الأنبیاء ٨٧)

- **پیتی(ف)لە(ف)دا:** ﴿فَلَا يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ﴾(الإسراء ٣٣)

- **پیتی (ك) لە (ك)دا:** ﴿أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ (النساء ٧٨)

- **پیتی (ل) لە (ل)دا:** ﴿قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ﴾ (الأنعام ١٩)

- **پیتی (و) له (و)دا:** ﴿حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدْ مَسَّ﴾ (الأعراف: ٩٥)

**بەڵام ئەگەر پیتی یەکەم پیتی مەددبوو تێهەڵکێش قەدەغەیە:**

- ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ (الرعد ٢٩)

- ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾ (الرعد ١٢)

**تێبینی: ئایەتی**﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ۝٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾(الحاقة ٢٨، ٢٩) **لەحاڵەتی گەیاندن (الوصل)دا بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە:**

١- **ئاشکراکردن (الإظهار): ئەویش بەوەستان (سَکتة) لەسەر وشەی (مَالِيهْ) پاشان خوێندنی (هلكَ) بێ هەناسە دان.**

٢- **تێهەڵکێشکردن (الإدغام): بەم شێوەیە (مَالِيهَّلكَ)، بەڵام شێوەی یەکەم لەپێشترە.**[١١٢]

[١١٢] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل ١٢٤-١٢٦، أحكام التجويد ل ٤٠- ٤١.

**٢- تێهەڵکێشی پیتە هاوڕەگەزەکان (إدغام المتجانسین):**

**بریتی یە لەو تێهەڵکێشەی کە ڕوو دەدات لەنێوان دوو پیتی لێکچوو لەمەخرەج و جیاواز لەسیفەتدا بەو مەرجەی پیتی یەکەم زەننەدارو دووەم بزواو بێت، ئەم جۆرەش لەحەوت شوێندا هەیەو دابەشدەبن بەسەر سێ مەخرەجدا:**

**أ- مەخرەجی (ط، ت، د): لەچوار شوێندا پێویستە:**

**١- تێهەڵکێشکردنی ناتەواوی پیتی (ط)ی زەننەدار لە (ت)دا:**

﴿لَئِنۢ بَسَطتَ.. ﴾(المائدة ٢٨) **واتە: بە (بسطت) دەخوێنرێتەوە، چونکە هەردوو سیفەتی (إستعلاء وإطباق)ی پیتی (ط) ماوەتەوە.**

**٢-تێهەڵکێشکردنی تەواوی پیتی (ت)ی زەننەدار لە (ط)دا:**

﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ... ﴾ (آل عمران ٦٩) **بە (ودطّائفة) دەخوێنرێتەوە.**

**٣- تێهەڵکێشکردنی تەواوی پیتی (ت)ی زەننەدار لە (د)دا:**

﴿ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ...﴾ (الأعراف ١٨٩)، **بە ( أَثْقَلَدَّعَوا) دەخوێنرێتەوە.**

**٤- تێهەڵکێشکردنی تەواوی پیتی (د)ی زەننەدار لە (ت)دا:**

﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾ (البقرة:٢٥٦) **بە (قتّبيَّنَ) دەخوێنرێتەوە.**

**ب– مەخرەجی (ظ، ذ، ث): ئەمیش لە دوو شوێندا پێویستە:**

**١– تێهەڵکێشکردنی پیتی (ذ) ی زەننەدار لە (ظ) دا کە دوو جار لە قورئاندا هاتووە:**

﴿إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ﴾ (النساء:٦٤)، **بە (إظّلموا) دەخوێنرێتەوە.**

﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ﴾ (الزخرف: ٣٩)

**بە (إظّلمتُم) دەخوێنرێتەوە.**

**٢– تێهەڵکێشکردنی پیتی (ث) ی زەننەدار لە (ذ)دا**

﴿أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ ... ﴾ (الأعراف: ١٧٦)

**بە (يلهذَّلك) دەخوێنرێتەوە.**

**ج– مەخرەجی (ب، م): ئەمیش لە یەك شوێندا پێویستە:**

**تێهەڵکێشکردنی پیتی (ب) لە (م)دا** ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾ (هود: ٤٢) [١١٣]

**بە (اِركمَّعنا) دەخوێنرێتەوە.**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

وَأَوَّلَيْ مِثْلٍ وَجِنْسٍ إِنْ سَكَنْ    أَدْغِمْ كَ: قُل رَّبِّ وَ: بَل لاَّ، وَأَبِنْ

فِي يَوْمِ، مَعْ: قَالُواْ وَهُمْ ....    ..................................

---

[١١٣] **بڕوانە: علم التجويد، د يحيى عبدالرزاق الغوثاني ل ١٢٥–١٢٦.**

**٣- تێهەڵكێشی پیتە لەیەك نزیكەكان (إدغام المتقاربين):**

**بریتی یە لەو تێهەڵكێشەی كە ڕوو دەدات لەنێوان دوو پیت لەمەخرەج وسیفەتدا لەیەكەوە نزیكن . بەڵام دەبێت پیتی یەكەم زەننەدارو دووەم بزواو بێت، ئەمجۆرەش لەقوڕئانی پیرۆزدا لەنێوان دوو مەخرەجدا ڕوویداوە:**

**أ- پیتی (ل) و (ر):**

﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا﴾ (طه ١١٤) ، ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ﴾ (النساء ١٥٨)

**ب- پیتی(ق)و (ك):**

﴿أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ﴾ (المرسلات ٢٠)

**تێبینی:**

**١- سەبارەت بە خوێندنەوەی وشەی(نَخْلُقكُّم) لەنێو زانایاندا ڕای جیاواز هەیە بەڵام لەلای (حفص) بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە:**

**أ- تێهەڵكێشكردنی تەواو: نەهێشتنەوەی سیفەتی (استعلاء)ی پیتی(ق). واتە: بە (ألم نَخلُكُّم) دەخوێنرێتەوە.**

**ب- تێهەڵكێشكردنی ناتەواو: هێشتنەوەی سیفەتی (استعلاء)ی پیتی(ق). بەڵام تێهەڵكێشكردنی تەواو باشترە.**[١١٤]

**بۆیە (ابن الجزري) وتوویەتی:**

.......................... ....... وَالخُلْفُ بِنَخْلُقْكُمْ وَقَعْ.

**٢- لە ئایەتی** ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم﴾ (المطففين:١٤) **تێهەڵكێش ڕوو نادات چونكە وەستان (سكتة) لەسەر وشەی (بَلْ) پێویست (واجب)ە.**

---

[١١٤] بڕوانە: علم التجويد، د يحيى عبدالرزاق الغوثاني ل ١٢٨.

## بەشی شەشەم

## یاساکانی نونی زەننەدار و ( تنوین )

**نونی زەننـەدار (ساکن): نـونێکی زەننـەدارە لەهەریـەك لـە نـاو (اسـم)و کـردار (فعـل)و پیـت (حـرف) لـەکۆتایی و ناوەڕاسـتی وشـەدا بـەدی دەکرێـت، دەنوسـرێت و دەخوێنرێتـەوە لەهـەردوو حاڵـەتی وەسـتان (وقف) وبەردەوام بوون (وصل)دا.**

**(التنـوین): نـونێکی زەننــەدارە، دەکەوێتــە کۆتــایی نــاو (اســم)ەوە، نانوسـرێت و تـەنها لـە بەیەکگەیشـتنی دوو وشـەدا دەخوێنرێتـەوەو نیشانەی دوو سەر یا دوو ژێر یا دوو بۆری بۆ دادەنرێت.**
**جا لـەکاتی بەیەکگەیشـتنی نـونی زەننـەدار یـان (تنـوین) بـە یـەکێك لـە پیتەکانی زمانی عەرەبی دەکرێن بە چوار حاڵەتەوە کە ئەمانەن:**

**١- ئاشکراکردن (الإظهار)**
**٢- تێهەڵکێشکردن (الإدغام)**
**٣- هەڵگەڕاندنەوە (القلب)**
**٤- شاردنەوە (الإخفاء)**

**(ابن الجزري) لەپێشەکیەکەیدا بەم شێوەیە باسی کردوون:**

وَحُكْمُ تَنْوِيْنٍ وَنُونٍ يُلْفَى إِظْهَارٌ ادْغَامٌ وَقَلْبٌ اخْفَا
فَعِنْدَ حَرْفِ الحَلْقِ أَظْهِرْ وَادَّغِمْ فِي اللاَّمِ وَالرَّا لاَ بِغُنَّةٍ لَزِمْ
وَأَدْغِمَنْ بِغُنَّةٍ فِي يُومِنُ إلاَّ بِكِلْمَةٍ كَدُنْيَا عَنْوَنُوا
وَالقَلْبُ عِنْدَ البَا بِغُنَّةٍ كَذَا لاخْفَا لَدَى بَاقِي الحُرُوفِ أُخِذَا

### ١- ئاشكراكردنی گەرووییی (الإظهار الحلقي)

ئاشــكراكردن و دەرخســتنی نــونی ســاكن یــا (تنــوین) لەمــەخرەجی خۆیەوە بە بێ مینگە (غنّة) و بێ وەستان لەسەری.

ئەم ئاشكراكردنەش لەكاتێكدایە نونی زەننەدار یا تەنوین لەگەڵ شەش پیت لە پیتەكانی زمانی عەرەبی بە یەك بگەن.

**پیتەكانی**: ئەو شەش پیتانە پێیان دەگوترێ پیتەكانی ئاشكراكردن ( إظهار) یا پیتەكانی گەروو (حلق) كە بریتین لە:

(أ، ه، ع، ح، غ، خ) كە لەسەرەتای ئەم وشانەدا كۆكراونەتەوە:

أخي هَاكَ عِلماً        حَازه غيرُ خاسِر

ئاشكراكردنی نونی (ساكن) لەیەك وشەداو لەدوو وشەدا ڕوو دەدات، بەڵام ئاشكراكردنی تنوین لەدوو وشەدا نەبێت ڕوونادات.

بۆ زیادو كەمی ئەم ئاشكراكردنە زانایانی تەجوید ئەم شەش پیتەیان كردووە بە سێ بەشەوە، لەمەخرەجەكاندا باسمان لێوە كرد.

**نموونە:**

| ژمارە | پیت | لەگەڵ نونی ساكن لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا | لەگەڵ تنوین |
|---|---|---|---|---|
| ١ | الهمزة | ينْأون | منْ آمن | عذابٌ أليم |
| ٢ | الهاء | ينْهون | إنْ هذا | سلامٌ هي |
| ٣ | العين | الأنْعام | منْ عمل | أجرٌ عظيم |
| ٤ | الحاء | تنْحتون | منْ حكيم | غفورٌ حليم |
| ٥ | الغين | فسينْغضون | منْ غلٍ | عفوٌ غفور |
| ٦ | الخاء | المنْخنقة | منْ خير | لطيفٌ خبير |

تێبینــی: بۆناســینەوەی نــونی ســاکن لەحالــەتی ئاشــکراکردندا لــە قورئانی پیرۆزدا زانایان سەری پیتی (ح)یان بەبچووکی لەسـەر نونەکـە داناوە، وەك : ﴿أَنۡعَمۡتَ﴾

بۆ(تنوین)یش لەهەمان حاڵەتدا نیشانەی ـٌۢ ـًۢ ـٍۭ یان داناوە.

٢- تێهەڵکێشکردن (الإدغام)

بریتیەلە بەیەکگەیشتنی نونی زەننەدار یا (تنـوین) لەگـەڵ شـەش پـیتی زمانی عەرەبی.

پیتەکانی: (ي، ر، م، ل، و، ن) لە وشەی (یرمُلون)دا کۆکراونەتەوە.

(یرمُلون) واتە: پەلەدەکەن، بە (یرمِلون)ەش دەخوێنرێتەوە.[115]

بەشەکانی تێهەڵکێشکردن (الإدغام):

ئەم تێهەڵکێشکردنە دووجۆرە:

١- تێهەڵکێشکردنی مینگەدار (إدغامٌ بغنّة)

بریتی یە لە بەیەکگەیشتنی نونی زەننەدار یا تەنوین لەگەڵ (چوار) لـەو شەش پیتە کەبریتین لەپیتەکانی وشەی (ینمو) یان (یومن).

ئەمیش دەکرێت بە دوو بەشەوە:

[115] إِعَانَةُ الْمُسْتَفِيدِ بِضَبْطِ مَتْنَي التُّحْفَةِ وَالْجَزَرِيَّةِ فِي عِلْمِ التَّجْوِيد.

### أ- تێهەڵکێشی تەواوی مینگەدار (إدغامٌ كاملٌ بغنّة)

پیتەکانی: دوو پیتی هەیە (ن، م).

بۆیە پێی گوتراوە تەواو چونکە پیتی یەکەم (نونی زەننەدار یا تنوین) بەتەواوی – بە پیت و سیفەتی مینگە – تێهەڵکێشی پیتی دووەم بووە.

نیشانەی لە (مصحف)دا: نیشانەی (شدّة)ی لەسەر پیتی دووەم بۆ دانراوە.

نموونە:

هاتنی نون بەدوای نونی زەننەداردا:﴿مَن نَّشاء، مِن نَّذير﴾

هاتنی میم بەدوای نونی زەننەداردا: ﴿مِن مَّال، مِن مَّسد﴾

هاتنی نون بەدوای (تنوین)دا: ﴿كلاً نُّمِدُّ، يومئذٍ نَّاعمة﴾

هاتنی میم بەدوای (تنوین)دا: ﴿درجاتٍ مِّنه، صُحُفاً مُّطهَّرة﴾

### ب- تێهەڵکێشی ناتەواوی مینگەدار (الإدغامُ الناقص بغنّة )

ئەمیش دوو پیتی هەیە: (و، ي).

بەڵام لێرەدا نونی زەننەدار یان (تنوین)ەکە بەتەواوی تێهەڵکێشی پیتی دووەم نەبووە، چونکە سیفەتی مینگەکەی ماوەتەوە، هەر بۆیە پێی وتراوە ناتەواو.[١١٦]

---

[١١٦] بڕوانە: السهل المفيد فى أحكام التجويد: إبراهيم أحمد. ل٢٦.

**نموونە:**

**هاتنی واو بەدوای نونی زەنن‌ەداردا: ﴿ مِن وال، مِن وليٍّ ﴾**

**هاتنی (يا) بەدوای نونی زەنن‌ەداردا: ﴿ مَن يؤمن، مَنْ يَشَاء﴾**

**هاتنی واو بەدوای (تنوين)دا: ﴿رحيمٌ ودود، معروفٌ و مغفرة﴾**

**هاتنی (يا) بەدوای (تنوين)دا: ﴿ خيراً يَرَه، وجوهٌ يَومئِذٍ ﴾**

**نیشانەی لە (مصحف)دا: نیشانەی (شدّة)ی بۆ دانەنراوە.[117]**

**٢- تێهەڵکێشی بێ مینگە (إدغامٌ بلا غنّة)**

**بریتییە لە بەیەکگەیشتنی نونی زەنن‌ەدار یان (تنوین) لەگەڵ دوو پیتەکەی تردا کە (ل، ر) یە. وە لێرەدا مینگە دروست نابێ چونکە هیچ سیفەتێکی نونەکە نامێنێ.**

**نموونە:**

**هاتنی (لام) بەدوای نونی زەنن‌ەداردا: ﴿ فإن لَّم ، ولكنْ لّا﴾**

**هاتنی (را) بەدوای نونی زەنن‌ەداردا: ﴿مِن رِّباط، مِن رَّبِّك﴾**

**هاتنی (لام) بەدوای (تنوين)دا: ﴿ فسلامٌ لَّك، هدىً لِّلمتقين﴾**

**هاتنی (را) بەدوای (تنوين)دا: ﴿أخذةً رَّابيةً، ثمرةٍ رِّزقاً ﴾**

**چەند تێبینیەك:[118]**

**١- تێهەڵکێشکردن لەدوو وشەدا ڕوو دەدات، بەڵام ئەگەر لەیەك وشەدا بوو دەبێت ئاشکرا (إظهار) بکرێت و، پێی دەگوترێت ئاشکراکردنێکی**

---

[117] بڕوانە: تيسير الرحمن ل ١٧٨.

[118] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل ١٧٤- ١٧٦، هداية القاري للمرصفي ل ٨٦-٨٨.

ڕەها (إظهارٌ مطلق)و لە قوڕئاندا لەچوار وشەدا ڕوویداوە: (الدّنْيا، صِنْوان، قِنْوان، بُنْيان).

٢- لەم دوو جێگەی قوڕئانی پیرۆزدا تێهەڵکێش ڕوو نادات بەڵکو نونە زەننەدارەکە ئاشکرا دەکرێت:

﴿ يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ (يس ١-٢)

﴿ نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ﴾ (القلم ١)

٣- لە وشەی ﴿طسٓمٓ﴾ ی سوورەتی (الشعراء)و (القصص) تێهەڵکێشکردنی نونی زەننەدار لە پیتی میم دا پێویستە.

٤- لە ئایەتی: ﴿ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴾ (القيامة: ٢٧)، تێهەڵکێش ڕوو نادات چونکە وەستان (سكتة) لەسەر وشەی (مَنْ) پێویست (واجب)ە.

٥- لەحاڵەتی وەستان (وقف) لەسەر نونی زەننەدار پێویست (واجب)ە نونەکە ئاشکرا بکرێت.

**٣- هەڵگەڕاندنەوە (القَلب)**

**بریتیە لە هەڵگەڕاندنەوەی نونی زەنندار یا (تنوین) بەمیمێکی شاراوە بەمینگەوە، لەکاتی گەیشتنی بە پیتی (ب)دا.**

**چۆنێتی دەربڕینی: هەڵگەڕاندنەوە بەسێ هەنگاو دەبێت:**

**١- هەڵگەڕاندنەوەی نونی زەنندار یا (تنوین) بۆ میمێکی تەواو .**

**٢- شاردنەوەی میمەکەش لەبەرگەیشتنی بەپیتی (ب)، هاوکات لەگەڵ داخستنی هەردوو لێو بەهێواشی و بێ فشار بۆ ئەوەی نەبێتە میمێکی (شدّة)دار.**

**٣- دەرخستنی مینگە بەئەندازەی دوو (حرکة)و، پاشان داخستنی لێو بەتەواوی بۆ دەربڕینی پیتی (ب)**

**(الجزري) دەڵێت:**

وَالقَلْبُ عِنْدَ البَا بِغُنَّةٍ كَذَا          لِاخْفَا لَدَى بَاقِي الحُرُوفِ أُخِذَا

**هەڵگەڕاندنەوە (إقلاب) لەیەك وشەو لەدوو وشەدا ڕوو دەدات.**

**نیشانەی لە (مصحف)دا: بۆحاڵەتی (إقلاب) ی نونی زەنندار میمێکی بچووکی لەسەر دانراوەو، بۆ (تنوین)یش: جووڵە (حرکة) یەکی لابراوەو بەدوایدا میمێکی بچووك دانراوە.**

**نموونە:**

- ﴿وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ﴾ (البيّنة ٤)

- ﴿كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾ (العلق ١٥)

### ٤- شاردنەوەی ڕاستەقینەیی (الإخفاء الحقيقي)

بریتیە لە دەربڕینی نونی زەننەدار یا تنوین لەگەڵ (١٥) پیت لە پیتەکانی زمانی عەرەبیدا، بەشێوەیەك کە نەدەرخستن (إظهار)ی تەواو بێت و نە تێهەڵکێشکردن (إدغام)ی تەواو بێت، لەگەڵ هێشتنەوەی مینگە (غُنَّة) بە ئەندازەی دوو جووڵە (حركة) بۆ پیتە شاراوەکە.

پێشی دەگوترێ (الإخفاء الحقيقي) بۆجیاکردنەوەی لە شاردنەوەی لێوی (گەشتنی نونی زەننەدار بە پیتی ب).

پیتەکانی:

( ث، ج، ذ، ز، س، ص، ض، ظ، ف، ش، ط، د، ت، ق، ك).

(الجمزوري) دەڵێت:

فِي خَمْسَةٍ مِنْ بَعْدِ عَشْرٍ رَمْزِهَا     فِي كِلْمِ هذَا الْبَيْتِ قَدْ ضَمَّنْتُهَا

صِفْ ذَا ثَنَا كَمْ جَادَ شَخْصٌ قَدْ سَمَا     دُمْ طَيِّبًا زِدْ فِي تُقًى ضَعْ ظَالِمَا

### چۆنێتی شاردنەوە (الإخفاء)

شاردنەوەی نونی زەننەدار یا تنوین ئەویش بە کەمێك دوور خستنەوەی زوبان لەپووکی دانەکانی سەرەوە، هاوکات لەگەڵ دەربڕینی مینگەو، پاشان ئامادەبوونی زمان بۆ مەخرەجی ئەو پیتەی نون یا (تنوین)ەکەی تێدا دەشارێتەوە، بەشێوەیەك کەمینگەکە بۆنی پیتی دوای خۆی بکات.[١١٩]

---

[١١٩] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١٨٣.

**تێبینی:**

**١- ئەگەر پیتی شاردنەوە (إخفاء) لەپیتەکانی (إستعلاء) واتە: (ص، ض، ط، ظ، ق) بوو پێویستە مینگەی شاردنەوەکە گەورە بکرێت.**

**وەك:** ﴿ يُنصَرُون، مِن صِيام، وَنَخِيلٍ صِنوان، مِن ضَعف، مَنضُود، مُسفِرَةٍ ضَاحِكَة، يَنطِقُون، مِن طِين، مُبَارَكَةً طَيِّبَة، يَنظُرُون، مَن ظَلَم، ظِلاً ظَلِيلا، أَن قَالُواْ، يَنقَلِبون، شَيءٍ قُبُلا ﴾

**ئەگەر پیتەکەش بچووك (مرقّق) بوو، پێویستە مینگەکە بچووك بکرێتەوە.**

**خاوەنی (السلسبيل الشافي) دەڵێت:**

وفَخِّمِ الغُنَّة إِنْ تَلاها    حُرُوفُ الِاستِعلاءِ لا سِواها

**٢- شاردنەوە لەیەك وشەو لەدوو وشەدا ڕوو دەدات.**

**٣- لە (مصحف) دا بۆ نونی زەننەدار لەحاڵەتی (إخفاء)دا هیچ جووڵە (حركة)یەکی بۆدانەنراوەو بۆ (تنوين)یش هەردوو (حركة) کە بەشوێن یەکدا دانراون.**

**پلەکانی شاردنەوە:**[١٢٠]

**١- بەرزترین پلەی شاردنەوە: لەگەڵ پیتەکانی (ط، د، ت) لەبەر نزیکی مەخرەجیان لە مەخرەجی پیتی نونەوە، واتە: چەندە مەخرەجیان لە نونەوە نزیکتر بێت زیاتر دەشارێنەوە، ئەویش بە دوورخستنەوەی**

---

[١٢٠] بڕوانە: الروضة النديّة شرح متن الجزرية ل٢٤، تيسير الرحمن ل ١٨٤.

**زمـان لەمـەخرەجی نـون و پشتبەسـتنی تـەواو بەمـەخرەجی کـەپوو (الخیشوم) بۆ زیاتر ئاشکراکردنی مینگەکەیان.**

**٢- نزمترین پلەی شاردنەوە: لەگەڵ هەردوو پیتی (ق، ك)دا، لەبەر دووری مـەخرەجیان لـە مـەخرەجی پیتـی نونـەوە، واتـە: ئاشـکراکردنی مینگەکانیان کەمترە.**

**٣- مامناوەند: لەگـەڵ (١٠) پیتەکـەی تـردا، چونکە مـەخرەجیان نـەزۆر دوورە لە پیتی نونەوەو، نەزۆر نزیکیشە لێیەوە.**

**نموونە:**

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا | پاش تنوین |
|---|---|---|---|
| الصاد | تنصروا | من صلح | ريحًا صرصرًا |
| الذال | منذرين | من ذنوبكم | سراعًا ذلك |
| الثاء | منثورا | من ثمرة | جميعًا ثمَّ |
| الكاف | ينكثون | من كل | شعيبًا كانوا |
| الجيم | أنجيناكم | إن جاءكم | فصبرٌ جميل |
| الشين | أنشأتم | فمن شاء | علمٍ شيئًا |
| القاف | منقلب | من قبل | ثمنًا قليلاً |
| السين | تنسلون | ولئن سألتهم | عابداتٍ سائحات |
| الدال | أندادًا | من دون | قنوانٌ دانية |
| الطاء | انطلقوا | من طيبات | صعيدًا طيبًا |
| الزاي | منزلين | من زكاها | يومئذٍ زرقًا |

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا | پاش تنوین |
|---|---|---|---|
| الفاء | منفكين | من فوقهم | متشابهاتٌ فأما |
| التاء | أنتم | من تحتها | جناتٍ تجري |
| الضاد | منضود | من ضل | مسجدًا ضرارًا |
| الظاء | ينظرون | من ظهير | ظلاً ظليلاً |

## بەشی حەوتەم

## یاساکانی میمی زەننەدار ( ساكن )

**میمی زەننەدار لەگەڵ پیتەکانی زمانی عەرەبیدا سێ حاڵەتی هەیە:**

**(الجمزوري) لە (التحفة)دا دەڵێت:**

أحكامُهَا ثلاثةٌ لمنْ ضَبَطْ إخفاءٌ ادغامٌ وإظهارٌ فَقَطْ

### یەکەم: شاردنەوەی لێوی (الإخفاء الشفوي)

**بریتی یە لەشاردنەوەی میمی زەننەدار لەکاتی گەشتنی بە پیتی (ب) لەگەڵ مانەوەی مینگە . ئەویش بە داخستنی هەردوو لێو بەهێواشی. پێشی دەوترێ شاردنەوەی لێوی (شفوي) لەبەر دەرچوونی هەردووپیتی (م،ب) لەلێوەوە.**

**(الجمزوري) دەڵێت:**

فَالأَوَّلُ الإِخْفَاءُ عِنْدَ الْبَاءِ وَسَمِّهِ الشَّفْوِيَّ لِلْقُرَّاءِ

**بۆچونێکی تریش هەیە میمی زەننەدار ئاشکرادەکات لەکاتی گەشتنی بەپیتی(ب)، بەڵام شاردنەوەی باشترە لەسەر ڕای زۆرینەی زانایان.**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

........................... ............... وَأَخْفِيَـنْ

الْمِيْمَ إِنْ تَسْكُنْ بِغُنَّةٍ لَدَى بَاءٍ عَلَى المُخْتَارِ مِنْ أَهْلِ الأَدَا

**تێبینی:**

**١- ئەم شاردنەوەیە تەنها لە دوو وشەدا ڕوودەدات.**

**٢- لە (مصحف)دا میمی زەنندداری شاراوە نیشانەی زەننە (سکون)ی بۆ دانەنراوە.**

**نموونە:**

﴿سَلۡهُمۡ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ﴾ (القلم: ٤٠)

﴿فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ (النازعات: ١٤)

## دووەم: تێهەڵکێشکردنی لێوی (الإدغام الشفوي)

**بریتی یە لە تێهەڵکێشکردنی پیتی (م)ی زەننەدار لەکاتی گەیشتنی بەمیمێکی بزواودا، بەشێوەیەك کەهەردووکیان ببنە میمێکی (مشدّد)ی مینگەدار.**

**ئەم تێهەڵکێشەش ناتەوەاوە چونکە سیفەتی پیتەکە کە مینگەیە دەمێنێتەوە.**

**تێهەڵکێشی بچووك و، لێکچوو (المتماثلین) یشی پێ دەوترێ.**

**بچووکە چونکە پیتی یەکەمیان زەننەدارە، لێکچووە چونکە هەردوو پیتەکە لەمەخرەج وسیفەتدا یەکیان گرتووە.**

**نموونە:**

﴿ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ﴾ (قریش ٤)

﴿ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ﴾ (الهمزة ٨)

## سێیەم: ئاشكرا كردنی لێوی (الإظهار الشفوي)[121]

**بریتـی یـە لەئاشـكرا كردنـی میمـی زەننـەدار لـەكاتی گەیشـتنی بـە پیتەكانی تری زمانی عەرەبی جگە لە (م، ب)، بە تایبەت لەگەڵ هەردوو پیتـی (ف، و)دا زۆر ئاشـكراترە لەبـەر جیاكردنـەوەیان لەیـەكتر چـونكە مەخرەجەكانیان لەیەكەوە نزیكە.**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

وَأَظْهِرَنْهَا عِنْدَ بَاقِي الأَحْرُفِ          وَاحْذَرْ لَدَى وَاوٍ وَفَا أنْ تَخْتَفِي

**پێیشـی دەوتـرێ لێـوی (شـفوي) چـونكە مـەخرەجی پیتـی مـیم هەردوولێوە.**

**خاوەنی (التحفة) دەڵێت:**

وَالثَّالِثُ الإِظْهَارُ فِي الْبَقِيَّهْ          مِنْ أَحْرُفٍ وَسَمِّهَا شَفْوِيَّهْ

**سوود:**

**لەم ئایەتەدا هەرسێ حوكمەكەی میمی زەننەدار كۆبووەتەوە:**

﴿ قَالُواْ طَـٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴾(يس:١٩)

**لەم ئایەتەشدا هەرسێ حوكمەكەی میمی زەننەدار بەهەردوو پیتی (ف، و)یشەوە كۆبوونەتەوە:**

﴿فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَـٰقَهُمۡ وَكُفۡرِهِم بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَقَتۡلِهِمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَقَوۡلِهِمۡ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾

(النساء:١٥٦)

---

[121] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١٩١-١٩٢ ، البسیط في علم التجوید ل ٢٩-٣٠

نموونە:

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا |
| --- | --- | --- |
| الهمزة | الظمْآن | عليكمْ أنفسكم |
| التاء | أمْتا | أمْ تأمرهم |
| الثاء | أمْثالكم | مرجعكمْ ثمَّ |
| الجيم | – | وما جعلناهمْ جسدًا |
| الحاء | يمْحق | أمْ حسبت |
| الخاء | – | أمْ خلقوا |
| الدال | وأمْددناهم | عليهمْ دائرة السوء |
| الذال | – | واتّبعتهمْ ذريَّتهم |
| الراء | أمْرا | ربكمْ رب السماوات والأرض |
| الزاي | رَمْزا | أمْ زاغت |
| السين | تُمْسون | فوقكمْ سبع طرائق |
| الشين | أمْشاج | لهمْ شراب من حميم |
| الصاد | – | وهمْ صاغرون |
| الضاد | وامْضوا | ألفوا آباءهمْ ضالين |
| الطاء | وأمْطرنا | مسَّهمْ طائف |
| الظاء | – | وهمْ ظالمون |
| العين | أمْعاءهم | همْ عن اللغو |
| الغين | – | فإنهمْ غير ملومين |
| الفاء | – | وهمْ فرحون |
| القاف | – | بل همْ قوم يعدلون |
| الكاف | يمْكث | إليكمْ كتابًا |

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا |
| --- | --- | --- |
| اللام | وأمْلي | أمْ لهم |
| النون | تُمْنَى | مسَّتهمْ نفحة |
| الهاء | يمْهدون | برهانكمْ هذا |
| الواو | أمْوات | حسابهمْ وهم |
| الياء | عُمْيًا | أمْ يريدون |

**تێبینی:**

**بۆحاڵەتی ئاشکراکردنی میمی زەننەدار لە (مصحف)ی پیرۆزدا سەرە پیتی (ح)ی بۆدانراوە، وەك:** ﴿ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ ﴾ (البقرة :٧)

# حوكمی میم و نونی (شدّة)دار

دەرخستنی مینگە (الغنّة) لەكاتی دەربڕینی میم و نونی (شدّة)داردا پێویست (واجب)ە، با لەیەك وشەشدا بێت.

نموونە بۆ نونی (شدّة)دار: (إنّ، الجنّة، النّاس)

نموونە بۆ میمی (شدّة)دار: (المزّمّل، محمّد، أمّا، ثمّ )

# لامی ناساندن ( لام التعريف )[١٢٢]

لامی ناساندن: لامێکی زەننەداری زیادەیە هەمزەیەکی (وصل)ی سەر (فتحة)دار پێشی دەکەوێت و، ناوێکیش بەدوایدا دێت.

دوو جۆری هەیە:

یەکەم: (الزائدة اللازمة): ئەو لامەیە کەهەمیشە لکاوە بەسەرەتای وشەکەوەو لێی جیانابێتەوە. وەك:

﴿ ٱلَّتِي، ٱللهِ، ٱلَّتِي، ٱلَّذِي، ٱلَّذِينَ، ٱلَّذَانِ، ٱلَّـٰٓئِي، ٱلْـَٔـٰنَ، وَٱلْيَسَعَ﴾

حوکمەکەی: ئەگەر بەدوایدا لام هاتبوو پێویستە تێهەڵکێش بکرێت وەك حەوت نموونەی سەرەتا، ئەگەر بەدوایشیدا پیتێکی تر هاتبوو – جگە لە لام – پێویستە ئاشکرابکرێت وەك دوو نموونەی کۆتایی.

دووەم: (الزائدة غير اللازمة): ئەو لامەیە کە لکاوە بەسەرەتای وشەکەوەو دەکرێت لێی جیابێتەوە.

ئەمیش دوو جۆری هەیە:

---

[١٢٢] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن ١٩٩–٢٠٣، تيسير الرحمن ل١٩٥–١٩٨

## یەکەم: لامی ( قَمَري )

ئـەو لامـە زەننەدارەیـە لـەپێش یـەکێك لەچـواردە پیتـە ( قمـري )ەکانـەوە دێت و دەنووسرێت و ئاشکرا دەکرێت.

پیتە ( قمري )ەکانیش ئەمانەن:

(أ، ب، غ، ح، ج، ك، و، خ، ف، ع ، ق، ي، م، ه)

خاوەنی (التحفة) لەبارەیانەوە دەڵێت:

لِلاَمِ أَلْ حَالاَنِ قَبْلَ الأَحْرُفِ       أُولاَهُمَا إِظْهَارُهَا فَلْتَعْرِفِ

قَبْلَ ارْبَعٍ مَع عَّشْرَةٍ خُذْ عِلْمَهُ       مِنِ( ابْغِ حَجَّكَ وَخَفْ عَقِيمَهُ)

نموونە:

| پیتەکان | نموونە | پیتەکان | نموونە |
|---|---|---|---|
| ء | الأرض | خ | الخلق |
| ب | البحر | ف | الفتح |
| غ | الغفور | ع | العاديات |
| ح | الحي | ق | القوي |
| ج | ذو الجلال | ي | اليمين |
| ك | الكبير | م | المؤمنون |
| و | الوارثون | هـ | الهدى |

نیشانەی لە (مصحف)دا:

دانانی زەننە (سەرە پیتی ح) لەسەر پیتە لامەکە.

## دووەم: لامی (شَمسي)

ئەو لامە زەننەدارەیە لەپێش یەکێك لەچواردە پیتە (شمسي)ەکانەوە دێت و دەنووسرێت و ناخوێنرێتەوە، بەڵکو تێهەڵکێش دەکرێت لە پیتە (شمسي)ەکەدا بەبێ مینگە تەنها پیتی (ن) نەبێت مینگەی هەیە.

پیتە (شمسي)ەکانیش ئەمانەن:

(ط، ث، ص، ر، ت، ض، ذ، ن، د، س، ظ، ز، ش، ل)

خاوەنی (التحفة) لەیەکەم پیتی وشەکانی دێڕی دووەمی ئەم شیعرەدا کۆیکردوونەتەوە:

ثَانِيهِمَا إِدْغَامُهَا فِي أَرْبَعِ     وَعَشْرَةٍ أَيْضًا وَرَمْزَهَا فَعِ

طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحْمَاً تَفُزْ ضِفْ ذَا نِعَم     دَعْ سُوءَ ظَنٍ زُرْ شَرِيفَاً لِلْكَرَم

وَالَّلامَ الأُولَى سَمِّهَا قَمْرِيَّهْ     وَالَّلامَ الأُخْرَى سَمِّهَا شَمْسِيَّهْ

نموونە:

| پیتەکان | نموونە | پیتەکان | نموونە |
|---|---|---|---|
| ط | الطّيب | ن | النّعيم |
| ث | الثّواب | د | الدّنيا |
| ص | الصّبر | س | السّائلين |
| ر | الرّقيب | ظ | الظّالمين |
| ت | التّائبون | ز | الزّاجرات |
| ض | الضّلال | ش | الشّاكرين |
| ذ | الذّاكرين | ل | الّيل |

نیشانەی لە (مصحف)دا:

دانانی (شدة) لەسەر پیتی دوای لامەکە.

## بەشی هەشتەم
## درێژکردنەوە ( المدّ )و بەشەکانی

درێژکردنـــەوە (المـــدّ): بريتيـــە لەدرێـــژ كردنـــەوەی دەنـــگ بەيـــەكێك لەپيتەكانی مەدد يا يەكێك لەپيتەكانی (اللين).

بەڵگە:

(موسـی)ی كـوڕی (يزيـد الكنـدي) دەڵێـت: (ابـن مسـعود) رضي الله عنه گـوێی لەخوێنـدنی پياوێـك دەگـرت، كاتێـك گەشـتە ئايـەتی:﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ... ﴾ (التوبة:٦٠) بـەبێ مـەدد خوێنديـەوە، ئـەويش وتـی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەيە بۆ منی نەخوێندەوە.

پياوەكەش وتی: ئەی چۆن بۆی خوێنديتەوە ؟

وتی:﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ..﴾ بەمەددەوە خوێنديەوە.[١٢٣]

پيتەكانی مەدد:

(ألف)ی زەنندەدار پيتی پێشەوەی سەر (فتحة) بێ وەك :﴿قَال، حَال﴾

(و)ی زەننەدار پيتی پێشەوەی بۆر (ضَمَّة) بێ وەك :﴿يَقُول، يَحُول﴾

(ي)ی زەننەدار پيتی پێشەوەی ژێر (كَسْرَة) بێ وەك :﴿قِيل، حِيل﴾

هەر سێكيان لە وشەی ﴿نُوحِيهَا، أُوذِينَا، وأُوتِينَا﴾ كۆكراونەتەوە.

---

[١٢٣] بڕوانە: السلسلة الصحيحة للألباني ژمارە : ٢٢٣٧.

**پیتەکانی (لین):**

**(و)ی زەننەدار  پیتی پێشەوەی سەر (فتحة)بێ وەك: ﴿خَوف﴾**

**( ي )ی زەننەدار پیتی پێشەوەی سەر (فتحة) بێ وەك: ﴿بَيت﴾**

**کەواتە: پیتی ئەلیف تەنها پیتی مەددە چونکە هەمیشە زەننەدارەو پێشەوەی سەر (فتحة)یە، بەڵام (و، ي) هەندێ جار پیتی مەددن کاتێك زەننەداربن و (حرکة)ی پێشەوەیان لەڕەگەزی خۆیانبێت، هەندێ جاریش تەنها پیتی (لین)ن کاتێك زەننەداربن و پێشەوەیان (مفتوح) بێت.**[١٢٤]

**(الجمزوري) دەڵێت:**

حُرُوفُهُ ثَلاَثَةٌ  فَعِيهَا          مِنْ لَفْظِ وَايٍ وَهْيَ فِي نُوحِيهَا
وَالكَسْرُ قَبْلَ الْيَا وَقَبْلَ الْواوِ ضَمْ          شَرْطٌ وَفَتْحٌ قَبْلَ أَلْفٍ يُلْتَزَمْ
وَاللِّينُ مِنْهَا الْيَا  وَوَاوٌ سُكِّنَا          إِنِ انْفِتَاحٌ قَبْلَ كُلٍّ أُعْلِنَا

---

[١٢٤] **بڕوانە: أحکام تلاوة القرآن ل ٢٠٩.**

**جیاوازی نێوان پیتی مەددو پیتی (الهمزة):**

| ڕووی بەراورد | (الهمزة) | پیتەکانی مەدد |
| --- | --- | --- |
| لەڕووی مەخرەجەوە | مەخرەجی کۆتایی گەرووە. | مەخرەجیان بۆشایی ناو دەم (جوف)ە . |
| لەڕووی بەهێزی و لاوازیەوە | پیتێکی بەهێزە | لاوازن |
| لەڕووی شێوەیانەوە | پیتێکی (حركة)دارە | (حركة) یان نیە |
| لەڕووی بنەڕەتی و لاوەکی یەوە | پیتێکی (أصلي) یە | پیتی لاوەکین |

## بەشەکانی درێژکردنەوە (المدّ)

مەدد دەکرێت بەدوو بەشی سەرەکیەوە:

١- مەددی بنەڕەتی (المد الأصلي)

٢- مەددی لاوەکی (المد الفرعي )

### یەکەم: مەددی بنەڕەتی (المد الأصلي):

بریتیە لەومەددەی کەبەبێ ئەو پیتەکە تەواو نابێت و، بەدوایدا (همزة) و (سکون) نیە.[١٢٥]

هۆی ناونانی: بنەڕەتیە لەچاو مەددەکانی تر داو، ئەندازەی درێژکردنەوەی تەنها دوو جووڵە (حركة)یە.

هەروەها پێشی دەوترێ مەددی ئاسایی (طبيعي) چونکە هەموو دەم و زمانێکی ساغ زیاترو کەمتر لەو ئەندازەیە درێژی ناکاتەوە.

(الجمزوري) دەڵێت:

وَالمَدُّ أَصْـليٌّ وَفَرْعِيٌّ لَهُ ... وَسَمِّ أَوَّلاً طَبِيعيًّا وَهُو

مَا لاَ تَوَقُّفٌ لَهُ عَلَى سَبَبْ ... وَلاَ بِدُونِه الْحرُوفُ تُجْتَلَبْ

بَلْ أَيْ حَرْفٍ غَيْرٌ هَمْزٍ أَوْ سُكُونْ ... جَا بَعْدَ مَدّ فَالطَبِيعيُّ يَكُونْ

---

[١٢٥] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ل ٢١٠.

**ئەندازەی مەددی ئاسایی:**

**سەبارەت بە ئەندازەی درێژکردنەوەی پیتەکانی مەدد زانایانی پێشین زاراوەی ئەلیفیان بەکارهێناوە، واتە: بۆ هەموو جۆرێك لەجۆرەکانی مەددی بنەڕەتی وتوویانە ئەندازەی ئەلیفێك درێژ دەکرێتەوە، زانایانی دوای ئەوانیش زاراوەی (حرکة)یان بەکارهێناوە،( حرکة)ش یەکەیەکی پێوانەییەو بریتیە لەزەمەنی دەربڕینی (فتحة)یەك یان (ضمّة)یەك یان (کسرة)یەك، هەر بۆیە بە (فتحة)یان وتووە ئەلیفی بچووك و بە(ضمّة) شیان وتووە واوی بچووك و بە (کسرة)شیان وتووە یای بچووك.**

**بەڵام پاش سەرنجدان بۆمان ڕووندەبێتەوە کە هەردوو زارەوەکە [واتە: ئەلیف و (حرکة)] هەمان مەبەست دەگەیەنن، چونکە مەبەست لەدوو(حرکة) واتە: (٢ ضمة) یان (٢ فتحة) یان (٢ کسرة).**

**کەواتە ماوە (زمن)ی پێویست بۆ دەربڕینی ئەلیفێك یەکسانە بەماوە (زمن)ی پێویست بۆ دەربڕینی دوو(حرکة)و هیچ جیاوازیەك لەنێوان ئەم دوو زاراوەیەدا نیە.**

**بەڵام زۆرێك لەزانایانی سەردەم دەڵێن: ئەندازەی دوو (حرکة) ئەوەندەیە کەبەخێراییەکی مامناوەند پەنجەت دابخەیت یان بیکەیتەوە.**

**بەڵام ئەم قسەیە قسەیەکی ڕوون نیەو بەپێوەر دانانرێت و ئەندازەکەی لەکەسێکەوە بۆکەسێکی تر دەگۆڕێت و، نەگونجاویشە لەگەڵ هەرسێ شێوازی خوێندنەوە( التحقیق، التدویر، الحدر) [١٢٦]**

**بۆیە پێویستە لای مامۆستایەکی خاوەن مۆڵەت ئەم یاسایە فێرببیت.**

---

[١٢٦] بڕوانە: حق التلاوة ل ١٩٥، تیسیر الرحمن ل ٢٠٥، علم التجوید للغوثاني ل ٤٧، کیف تقرأ القرآن للدکتور أیمن رشدي سوید (وانەی ٥٣-٥٤)

## بەشەکانی مەددی ئاسایی (طبيعي):

مەددی ئاسایی دەکرێت بە (دوو) بەشەوە:[١٢٧]

١- مەددی ئاسایی وشەیی (المد الطبيعي الكلمي)

٢- مەددی ئاسایی پیتیی (المد الطبيعي الحرفي)

١- مەددی ئاسایی وشەیی (المد الطبيعي الكلمي):

ئەم مەددەش لەیەك وشەدا ڕوودەدات و، سێ جۆری هەیە:

أ- مەددی ئاسایی جێگیر لەکاتی بەردەوامبوون و وەستاندا (المد الطبيعي الثابت وصلا ووقفا):

ئەگەر دوای پیتی مەدد پیتێکی بزواو (متحرك) لەحاڵەتی وەستان (وقف)و بەردەوامبوون (وصل)دا هاتبێت، لەسەرەتاوە بێت یان لەکۆتایی.

وەکو: ﴿ مَالِكِ، يُوصِيكُمْ، بِيَمِينِهِ، وَضُحَاهَا، قَالُوا، وَأُمْلِي ﴾

ب- مەددی ئاسایی جێگیر لەکاتی وەستاندا (المد الطبيعي الثابت في الوقف دون الوصل):

ئەم جۆرەیان تەنها لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا بوونی هەیە، ئەویش لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

---

[١٢٧] بڕوانە: هداية القاري للمرصفي ل (١٣٣-١٣٥)، غاية المريد في علم التجويد ل(٤٨-٤٩)، تيسير الرحمن ل (٢٠٦-٢٠٧)

- **بەدوای پیتی مەددا لە وشەیەکی تردا پیتێکی زەننەدار هاتبێت، واتە: (التقاء الساكنين):**

**نموونەی ئەلیف:**

﴿فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ...﴾(النساء:١٧٦) ، ﴿وَقَالَا ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾(النمل:١٥)

﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ﴾(القصص:٢٠)،﴿ طَغَا ٱلۡمَآءُ﴾ (الحاقه:١١)

**نموونەی واو:**

﴿ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ﴾ (المطففين ١٦) ، ﴿وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ﴾ (الأنفال:٣٢)

**نموونەی (یاء):**

﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِى ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ (الفجر ١٠) ،﴿حَاضِرِى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ (البقرة:١٩٦)

- **وەستان لەسەر ناوە (مقصور)ەکان:**

**وەکو: ﴿ هُدًى، ضُحًى، مُصلًّى، عَمًى، سُدًى﴾**

- **وەستان لەسەر ناوە (منصوب)ەکان:**

**وەکو: ﴿وَكِيلاً، حَسِيباً، حَكِيماً، حَدِيثاً ﴾**

**ئـەم جـۆرە مـەددی لـەجیاتی (العِـوضِ)ی پـێ دەگوترێـت، واتـە: هێنانی پیتی ئەلیف لەجیاتی (تنوین) لەحاڵەتی وەستاندا.**

**هەروەها وەستان لەسەر وشەی** ﴿وَلَيَكُونًا﴾، ﴿لَنَسۡفَعًۢا﴾، ﴿إِذًا﴾، **بە** (وَلَيَكُونَا)**و** (لَنَسْفَعَا)**و** (إِذَا) **دەخوێنرێتەوە.**

- **ئەگـەر پیتـی مەددەکـە پیتـی (ألـف) بێـت ئـەویش لـەم (حـەوت) وشەیەی خوارەوەدا:**

(أَنَاْ) **بۆ نموونە:** ﴿ وَلَآ أَنَاْ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ﴾ (الكافرون ٤)

(لَّٰكِنَّاْ) **لەئايەتی** ﴿لَّٰكِنَّاْ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى ﴾ (الكهف ٣٨)

(الظُّنُونَا) **لەئايەتی** ﴿وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَاْ ﴾ (الأحزاب ١٠)

(الرَّسُولَا) **لەئايەتی** ﴿وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَاْ ﴾ (الأحزاب ٦٦)

(السَّبِيلَا) **لەئايەتی** ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَاْ ﴾ (الأحزاب ٦٧)

(قَوَارِيرَا) **لەئايەتی**﴿ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَاْ ﴾ (الانسان ١٥)

(سَلَاسِلَاْ) **لەئايەتی** ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا﴾ (الانسان ٤)

**تێبینی:**

**یەکەم: لەکاتی وەستان لەسەر وشەی (سَلَاسِلَاْ) دەشتوانی ئەلیفەکەی نەخوێنیتەوەو لەسەر پیتی لام بوەستی، بەڵام لەحاڵەتی بەردەوامبوون (وصل)دا دەبێت ئەلیفەکە نەخوێنرێتەوە.**[١٢٨]

**دووەم: بەڵام وشەی (قَواريرَا)ی دووەمی سورەتی (الانسان: ١٦) لە حاڵەتی بەردەوامبوون و وەستاندا ئەلیفەکەی ناخوێنرێتەوە.**[١٢٩]

**سێیەم: لە (مصحف)ی پیرۆزدا سفرێکی درێژ لەسەر ئەلیفی ئەم حەوت وشەیە دانراوە، واتە نەخوێندنەوەیان لەکاتی( وصل)دا.**[١٣٠]

---

[١٢٨] **بڕوانە: مذكرة في أحكام التجويد (٢٥/١).**

[١٢٩] **بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد ل١٠٤.**

[١٣٠] **بڕوانە: فتح رب البريّة ل ٦٤.**

**ج- مەددی ئاسایی جێگیر تەنها لەکاتی بەردەوامبووندا (المد الطبيعي الثابت في الوصل دون الوقف):**

**ئەمیش لەم دوو حاڵەتەی خوارەوەدا:**

**حاڵەتی یەکەم: مەددی ڕاناوی بچووك (الصلة الصغرى): ئەو ڕاناوە بزواوەیە کەبۆ تاکێکی ئامادە نەبووی نێر بەکاردێت و دەکەوێتە کۆتایی وشەوە لە نێوان دوو پیتی بزواودا بەمەرجێك بەدوایدا پیتی (همزة) نەیەت.**

**وەکو:**

﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾، **بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە:(لَهُو كُفوً).**

﴿فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا ۝٤ فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا﴾ (العاديات ٤-٥) **بە(بهي نقعا)و (بهي جمعا) دەخوێنرێتەوە.**

**ئەندازەکەشی دوو جووڵە (حرکة) درێژ دەکرێتەوە لەحاڵەتی بەردەوام بووندا.**

**حاڵەتی دووەم: ئەگەر پیتی مەدد کەوتە پێش پیتی کۆتاییەوە ئەوا دەبێتە مەددێکی ئاسایی لەکاتی بەردەوام بووندا، بەڵام لەحاڵەتی وەستاندا دەبێتە مەددی توشهاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون)و دەتوانرێت دوو یان چوار یان شەش(حرکة)درێژبکرێتەوە.**

**وەکو:** ﴿ بصِير، الحِساب، الرَّاكعون ﴾

**٢- مەددی ئاسایی پیتیی (المد الطبيعي الحرفي):**

**ئەو پیتانە دەگرێتەوە لە سەرەتای هەندێ لەسوڕەتەکاندا هاتوون .**
**پیتەکانی: ئەم مەددەش لەپێنج پیتدا هەڵهێنراوە: (ح، ي، ط، ه، ر) لە ڕستەی (حي طهر)دا کۆکراونەتەوەو، بە( حا، یا، طا، ها، را ) دەخوێنرێنەوە.**
**پیتی (ح) لەوشەی (حم)ی حەوت سوڕەتدا (غافر، فصلت، الشورى، الزخرف، الدخان، الجاثية، الأحقاف )**
**پیتی (ي) لە (كهيعص)ی سوڕەتی (مريم)و، لە (يس).**
**پیتی (ط) لەسوڕەتی (طه) ، (طسم)ی سوڕەتی الشّعراء)و (القَصَص)، (طس)ی سوڕەتی (النمل).**
**پیتی (ه) لە ( كهيعص )، (طه)**
**پیتی (ر) لە (الر)ی هەر پێنج سوڕەتی (یونس، هود، يوسف، إبراهيم، الحجر)و، لە ( المر)ی سوڕەتی (الرَّعد).**

## مەددی لاوەکی (الفرعي)و بەشەکانی:

**پێناسە:** درێژ کردنەوەی پیتی مەدد زیاد لەمەددی ئاسایی، لەبەر هۆکارێك لەهۆکارەکان.[131]

**هۆکارەکانی:** گەیشتنی پیتەکانی مەدد بە پیتی (همزة:ء) یا پیتێکی زەنتەدار.

(الجمزوري) دەڵێت:

وَالآخَرُ الْفَرْعِيُّ مَوْقُوفٌ عَلَى سَبَبْ كَهَمْزٍ أَوْ سُكُونٍ مُسْجَلا

**جۆرەکانی دوانن:**

**یەکەم:** ئەو مەددانەی بەهۆی پیتی (همزة) وە ڕوو دەدەن.

**دووەم:** ئەو مەددانەی بە هۆی پیتێکی زەنتەدارەوە ڕوو دەدەن.

### یەکەم: ئەو مەددانەی بە هۆی (همزة) وە ڕوو دەدەن:

سێ جۆرن:

١- مەددی پێویستی لکاو (المد الواجب المتصل).

کاتێك بەدوای یەکێك لەپیتەکانی مەددا پیتی (همزة) هاتبێت لەیەك وشەدا.

ئەم درێژ کردنەوە پێویست (واجب)ە چونکە گشت خوێنەران (القُرّاء) بڕیاریان لەسەردرێژ کردنەوەی داوە.

---

[131] تیسیر الرحمن ل (٢٠٨).

**ئەندازەی درێژ کردنەوەی:**
**(٤) یان (٥) جووڵەیە، بەڵام (٤) جووڵە بەناوبانگترە.**
**هۆی ناونانی: لکاو (متصل) چونکە لەیەك  وشەدا ڕوو دەدات.**

**(ابن الجَزري) دەڵێت:**

وَوَاجِبٌ إنْ جَاءَ قَبْلَ هَمْزَةِ          مُتَّصِلاً إِنْ جُمِعَا بِكِلْمَةِ

**نموونە:**

**پیتی مەدد لە ناوەڕاستدا:** ﴿فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا﴾، ﴿ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾، ﴿لِيَسُـُٔوا﴾

**پیتـی مـەدد لـە کۆتاییـدا:** ﴿وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ﴾، ﴿يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾، ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ﴾

**تێبینی: ئەگەر پیتـی (همزة) کەوتـە کۆتـایی وشـەو لەسـەری وەسـتایت دەتـوانی تـا (٦) جووڵـەش درێـژی کەیتـەوە، چـونکە دەبێتـە مـەددی توشهاتوو بە زەننە (العارض للسکون)، وەکو:**

﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ﴾ (الجمعة ٤)

﴿إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ (غافر ٥٨)

**٢- مەددی ڕێپێدراوی جیا (المد الجائز المنفصل).**
**کاتێك یەکێك لەپیتەکانی مەدد لەکۆتایی وشـەیەکداو پیتـی (همـزة) لـە سەرەتای ووشەیەکی تردا کەبەدوای ئەودا هاتبێت.**
**ئەندازەی درێژ کردنەوەی: دەتوانرێ (٤) یان (٥) جووڵە درێژ بکرێتەوە بەڵام (٤) بەناوبانگترە.**

**هۆی ناونانی:**

**پێی گوتراوە جیا (منفصل) چونکە لەدوو وشەدا ڕوو دەدات.**

**هەروەها پێی گوتراوە ڕێپێدراو (جائز) چونکە لەلای هەندێك لەخوێنەران (القراء) کورتکردنەوەی بۆ (٢) جووڵەش (واتە: القصر) دروستە.**

**(ابن الجَزري) دەڵێت:**

وَجَائِزٌ إِذَا أَتَى مُنْفَصِلاً ....................

**نموونە:**

**کاتێك پیتە مەددەکە بخوێنرێتەوەو بنووسرێت وەك:** ﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴾(الكافرون:٥)، ﴿وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴾(المطففين:٣١)

**یان بخوێنرێتەوەو بەڵام نەنوسرابێت وەك:**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، ﴿ يَٰٓـَٔادَمُ ﴾، ﴿ يَٰٓأَهۡل﴾، ﴿هَٰٓأَنتُم﴾

**تێبینی:**

**ئەم جۆرە مەددە تەنها لەکاتی بەردەوامبوون (وصل)دایە، خۆئەگەر لەسەر وشەی یەکەم وەستای لە (٢) جووڵە زیاتر درێژی ناکەیتەوە.**

٣- مەددی گۆڕاو( البدل).[١٣٢]

ئەگەر لەپێش پیتی مەددەوە لەیەك وشەدا پیتی (همزة) هاتبێت و لەدوای پیتی مەددیشەوە (همزة)و زەننە نەهاتبێت.

هۆی ناونانی: بۆیە ناونراوەمەددی گۆڕاو (البدل) چونکە پیتە مەددەکە لەبنەڕەتدا هەمزەیەکی زەننەدار بووە بەپێی یاسای زانستی (الصرف) هەرکات دوو هەمزە لەسەرەتای وشەیەکدا کۆبونەوە یەکەمیان بزواو ودووەمیان زەننەداربێت دوومیان دەگۆڕی بۆ پیتی مەدد لەڕەگەزی جووڵەی پیتی پێش خۆی.

ئەندازەی درێژکردنەوەی: لەلای (حفص) تەنها دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە.

نموونە:

﴿ ءَادم ﴾، ﴿ أُوتوا ﴾، ﴿ إِيتَاء ﴾، ﴿ لِإِيلَافِ ﴾، ﴿ ءَامَنَ﴾

لەبنەڕەتدا (أَأْدم)، (أُؤْتوا)، (إِئْتاء)، (لإِئْلاف)، (أأْمن) بوون.

مەددی لێکچوو بەگۆڕاو (المد الشبيه بالبدل):

خوێنەری بەڕێز، هەر پیتێکی مەدد بەدوای (همزة)دا هاتبێ زانایان بەپاشکۆی مەددی (بدل) یان داناوەو، هەمان حوکمی مەددی گۆڕاو (البدل) وەردەگرێت، با لەبنەڕەتیشدا هەمزە نەبووبێت.[١٣٣]

وەك: ﴿ لَيَـُٔوسٌ﴾، ﴿ يَشَآءُون ﴾، ﴿ مُتَّكِـِٔين﴾، ﴿ مَـَٔابٍ﴾

---

[١٣٢] تيسير الرحمن ل ٢١٦-٢١٧.

[١٣٣] الروضة الندية شرح متن الجزرية ل ٣٢.

**حاڵەتەکانی مەددی گۆڕاو (البدل):**

**چوار شێوەی هەیە:**

**١- جێگیرە لە بەردەوامبوون (وصل)و، وەستان (وقف)دا:**

**ئەگەر لەسەرەتاوە یان لەناوەڕاستەوە هاتبوو، وەکو:**

﴿ءَامَنَ الرَّسول ﴾، ﴿إِي وَرَبِّي ﴾، ﴿أَنبِئُوني ﴾، ﴿نَبِّؤُونِي ﴾

**٢- تەنها لە (وصل)دا جێگیرە (درێژ دەکرێتەوە):**

**وەکو:** ﴿ الخَاطِئِين ﴾، ﴿ مُستَهزِءُون ﴾، ﴿ يُرَاءُونَ ﴾

**بەڵام لەحاڵەتی (وقف)دا دەبێتە مەددی توشهاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون) ئەو کاتە (٢) یان (٤)یان (٦) جووڵە درێژ دەکرێتەوە .**

**٣- جێگیرە تەنها لە وەستان (وقف)دا:**

**وەك:** ﴿ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ ﴾ **ئەگەر لەسەر وشەی (وَجاءُو) وەستایت دەبێتە مەددی گۆڕاو (بدل)و دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە .**

**٤- جێگیرە تەنها لەسەرەتاوە: وەکو وشەی (ائۡتُونِي)ی ئایەتی**

﴿أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ﴾ (الأحقاف ٤)

**واتە لەکاتی (وصل)دا بە (السماواتِئـتوني) دەخوێنرێتەوە بەبێ هەمزە. بەڵام ئەگەر لەسەر وشەی (السَّمَاوَاتِ) وەستایت و پاشان دەستکردەوە بەخوێندنی (ائۡتُونِي) بە (إيـتوني) دەیخوێنیتەوەو دوو جووڵە درێژی دەکەیتەوەو دەبێتە مەددی (بدل).**

**هەروەها:**

﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ﴾ (التوبة ٤٩)

﴿وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾ (الأعراف ٧٧)

﴿فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ﴾ (البقرة: ٢٨٣ )

**گەر لەسەرەتاوە خوێنرایەوە بە (إيذن لي)و (إِيتنَا)و (أوتمن) دەخوێنرێنەوە.**

**دووەم: ئەو مەددانەی بەهۆی پیتێکی زەنندارەوە ڕوو دەدەن**

**ئەمانیش دوو جۆرن:**

**١- مەددی پێویست (المد اللازم ).**

**٢- مەددی توشهاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون).**

**٣- مەددی (اللين)**

**١- مەددی پێویست (المد اللازم ).**

**بەدوای پیتی مەددا پیتێکی زەنندداری بنەڕەتی لەهەردوو حاڵەتی وەستان و بەردەوامبووندا لە وشەیەکدا یان لەپیتێك لەپیتەکانی سەرەتای هەندێ لەسوڕەتەکاندا.[١٣٤]**

**هۆکاری: هۆی ئەم مەددە بەیەکگەیشتنی دووپیتی زەنندارە، کە پیتی مەددو پیتە زەنندارە بنەڕەتیەکەیە، پیتی یەکەم درێژدەکرێتەوە بۆ ئەوەی درێژکردنەوەکە وەك پیتێکی لێبێت و بکەوێتە نێوان دوو پیتە زەنندارەکەوە.**

**ئەندازەی درێژکردنەوەی: پێویستە شەش جووڵە درێژ بکرێتەوە .**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

**فلازِمٌ إنْ جاءَ بعْدَ حرفِ مَد ساكِنُ حَالَيْن وبالطول يُمَد**

**هۆی ناونانی:**

---

[١٣٤] **تيسير الرحمن ل ٢٢١.**

هەموو خوێنەران (القرّاء) یەکدەنگن لەسەر تەواو درێژکردنەوەی (الإشباع) لەهەردوو حاڵەتی بەردەوامبوون و وەستاندا.[135]

بەشەکانی: مەددی (لازم) دەبێت بەدوو بەشەوە:

أ- مەددی پێویستی وشەیی (المد اللازم الكلمي)

ب- مەددی پێویستی پیتیی (المد اللازم الحرفي)

هەریەك لەم دوانەش دەبن بەدوو بەشەوە:

قورسکراو (مُثقل)، سوككراو (مُخَفَّف)

(الجمزوري) له (التحفة)دا بەم شێوەیە ئاماژەی بۆ هەرچواریانکردووە:

أَقْسَامُ لاَزِمٍ لَدَيْهِمْ أَرْبَعَهْ وَتِلْكَ كِلْمِيٌّ وَحَرْفِيٌّ مَعَهْ
كِلاَهُمَا مُخَفَّفٌ مُثَقَّلُ فَهَذِهِ أَرْبَعَةٌ تُفَصَّلُ

أ- مەددی پێویستی وشەیی(المد اللازم الكلمي):

ئەگەر بەدوای پیتی مەدد دا پیتێکی زەنندەداری هەمیشەیی لەهەمان وشەدا هاتبوو، ئەمیش دوو جۆرە:

(١) مەددی پێویستی وشەیی قورسکراو (مُثَّقل):

ئەگەر لەدوای پیتی مەددەوە پیتێکی (شدّة) دار هاتبوو. وەك:

﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾، ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾،﴿دَآبَّةٖ﴾، ﴿ءَآلذَّٰكَرَيۡنِ﴾، ﴿ءَآللَّهُ﴾، ﴿أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي﴾

پیِّ ی وتراوە وشەیی:

چونکە پیتە زەنندەرە بنەڕەتیەکە بەدوای پیتی مەدد دا لەیەك وشەدا هاتووە.

[135] الروضة الندية شرح متن الجزرية (٣ / ٢٥).

قورسکراو: چونکە تێهەڵکێش دەکرێت.

(٢) مەددی پێویستی وشەیی سووککراو (مخفّف):

ئەگەر لە دوای مەددەوە پیتێکی زەنندەداری بنەڕەتی بێ (شدّة) هاتبوو.

نموونە: لە قورئانی پیرۆزدا تەنها وشەی ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾ هەیەو دووجار لە سورەتی (یونس)دا لە ئایەتی (٩١،٥١) هاتووە.

پێی وتراوە: سوککراو لەبەر ڕوونەدانی تێهەڵکێش.

تێبینی: سێ وشە لە شەش جێگەی قورئانی پیرۆزدا مەددی پێویستی وشەیین بەڵام بە بێ درێژکردنەوەش (التسهيل) دەخوێنرێنەوە.

وشەی ﴿ءَآلذَّكَرَيۡنِ﴾ دوو جار لەسورەتی (الأنعام)دا

وشەی ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾ دوو جار لەسورەتی (یونس)دا

وشەی ﴿ءَآللَّهُ﴾ یەکی جارێك لەسورەتی (یُونس)و لە (النمل)دا هاتووە .

هەندێ لەزانایان ئەم حاڵەتەیان ناوناوە مەددی جیاکردنەوە (الفَرق) کاتێك هەمزەی پرسیار (استفهام) دەکەوێتە پێش (ألـ)ی ناساندن (التعريف) ودەبێتە پیتی مەدد.

هۆی ناونانیشی بۆجیاکردنەوەی پرسیار (استفهام) لە هەواڵ (الخبر).[١٣٦]

---

[١٣٦] بڕوانە: إحكام الأحكام في تجويد القرآن ل ٢١.

**ب- مەددی پێویستی پیتیی (المد اللازم الحرفي):**

**ئەگەر بەدوای پیتی مەدد یان (لین)دا (واتە پیتی عین) پیتێکی زەنندەداری بنەڕەتی هاتبوو لە یەکێك لەپیتەکانی سەرەتای هەندێك لەسوڕەتەکاندا، بەمەرجێك ئەو پیتە هیجاکەی لەسیٚ پیت کەمتر نەبێت و پیتی ناوەڕاستی پیتی مەدد بێت ، ئەمیش دوو جۆرە:**

**(١) مەددی پێویستی پیتی قورسکراو (مُثَقَّل):**

**ئەگەر دوای پیتی مەدد پیتێکی تێهەڵکێشکراو (مدغم) هاتبیٚ.**

**وەك:** ﴿الٓمٓ﴾، ﴿طسٓمٓ﴾

**پێی وتراوە:**

**پیتی: چونکە پیتە زەنندەدارە بنەڕەتیەکە بەدوای پیتی مەدد دا لەیەك وشەدا هاتووە.**

**قورسکراو: چونکە لەبەر ڕوودانی تێهەڵکێش.**

**(٢) مەددی پێویستی پیتی سووك (مُخَفَّف):**

**ئەگەر دوای پیتی مەدد پیتێکی زەنندەداری تێهەڵکێش نەکراو هاتبیٚ.**

**وەك:** ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾، ﴿يسٓ﴾

**پێی وتراوە: سوککراو لەبەر ڕوونەدانی تێهەڵکێش .**

**(الجمزوري) لە مەتنەکەیدا دەڵێت:**

فَإِنْ بِكِلْمَةٍ سُكُونٌ اجْتَمَعْ — مَعْ حَرْفِ مَدٍّ فَهْوَ كِلْمِيٌّ وَقَعْ

أَوْ فِي ثُلاَثِيِّ الحُرُوفِ وُجِدَا — وَالمَدُّ وَسْطُهُ فَحَرْفِيٌّ بَدَا

كِلاَهُمَا مُثَقَّلٌ إِنْ أُدْغِمَا          مَخَفَّفٌ كُلٌّ إِذَا لَمْ يُدْغَمَا

## پیتە بچراوەکان (الحروف المقطعة)ی سەرەتای سوڕەتەکان [137]

**ئـــەم پیتانـــە ژمارەیـــان چـــواردە پیتـــە (الجمـــزوري) لـــەم دێـــڕەدا کۆیکردوونەتەوە:**

وَيَجْمَعُ الْفَوَاتَحِ ٱلارْبَعْ عَشَرْ          صِلْهُ سُحَيْراً مَنْ قَطَعْكَ ذَا اشْتَهَرْ

**هەندێکی تر لەزانایان لە ڕستەی (نصٌّ حكيمٌ قاطعٌ له سرٌّ) .**

**ئـەم (١٤) پیتـە لەسـەرەتای (٢٩) سـوڕەتدا هـاتوون و، دەکـرێن بـە پێـنج بەشەوە:**

١- **یەك پیتی: لە (٣) سوڕەتدا :** ﴿صٓ﴾، ﴿قٓ﴾، ﴿نٓ﴾.

٢- **دووپیتـــی: لـــە (١٠) ســـوڕەتدا:** ﴿طه﴾، ﴿طسٓ﴾ ، ﴿حمٓ﴾ **لـــە (٧) سوڕەتدا.**

٣- **ســـێ پیتـــی: لـــە (١٣) ســـوڕەتدا:** ﴿الٓمٓ﴾ **لـــە ســـوڕەتی (البقـــرة)، (آل عمران)، (العنكبوت)، (الرّوم)، (لقمان)، (السَّجدة)دا.**

﴿الٓر﴾ **لە سوڕەتی (يُونُس)، (هود)، (يُوسُف)، (إبراهيم)، (الحِجر)دا.**

﴿طسٓمٓ﴾ **لە سوڕەتی (الشُّعراء)، (القَصَص)دا.**

٤- **چوارپیتی: لەدوو سوڕەتدا:** ﴿الٓمٓصٓ﴾ **الأعراف،** ﴿الٓمٓر﴾**الرَّعد.**

٥- **پێنج پیتـی: لـەدوو سوڕەتدا:** ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ **مـریم،** ﴿حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ﴾ **الشورى.**

---

[137] **بڕوانە: تيسير الرحمن ل ٢٢٥-٢٢٦.**

**حوكميان: ئەم چواردە پیتە لەڕووی حوکمیشەوە دەبن بەچوار بەشەوە:**

**١- مەددی پێوستن و دەبێت (٦) جووڵە درێژ بکرێنەوە:**

**ئەو سێ پیتیانەن کەناوەڕاستیان پیتی مەددەو بەدوایاندا زەنەی بنەڕەتی هاتووە، ژمارەیان (حەوت) پیتەو لەم ڕستەیەدا کۆکراونەتەوە: (سنقص لکم)، وەبەم شێوەیە دەخوێنرێنەوە :**

**سین، نون، قاف، صاد، لام، کاف، میم.**

**٢- تێرکردن (الإشباع)و، ناوەند (التوسط):**

**ئەو سێ پیتیانەن ناوەڕاستیان پیتی (لین)ە، ئەویش تەنها پیتی (ع: عین)ەو، لە سەرەتای سوڕەتی مریم ﴿كٓهيعٓصٓ﴾و لەسەرەتای سوڕەتی الشوری ﴿عٓسٓقٓ﴾دا هاتووە.**

**دەتوانرێ (٦) جووڵە درێژ بکرێتەوە چونکە مەددی پێویستی پیتی سووکەو، دەشتوانرێ (٤) جووڵە درێژ بکرێتەوە و وەکو مەددی (لین)ی لێبکرێت، بەڵام پێی ناوترێ مەددی (لین) چونکە بەدوایدا زەنەی بنەڕەتی هەیەو مەددی (لین)یش بەدوایدا زەنەی کاتی هەیە، بۆیە هەندێ لەزانایان ناوی (اللين اللازم)یان لێناوە.**

**بەڵام لەکاتی خوێندنەوەیدا تێرکردن (الإشباع) واتە: تەواو درێژکردنەوە لەپێشترە.**

٣- درێژکرنەوەی ئاسایی: ئەوانەن کە لەدووپیت پێك هاتوون بەلاَم پیتی دووەمیان پیتی مەددەو، ژمارەیان (٥) پیتە لە ڕستەی (حيّ طهر)دا کۆکراونەتەوەو، بە (حا، یا، طا، ها، را) دەخوێنرێنەوە.

٤- بەهیچ شێوەیەك درێژناکرێنەوە: ئەوانەن کەلە (٣) پیت پێکهاتوون و ناوەڕاستیان پیتی مەددو (لین) نیە، ئەمیش تەنها پیتی (ألِف) دەگرێتەوە.

## ٢- مەددی توشهاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون).

**ئەگەر بەدوای پیتی مەددا پیتێکی زەننەدار بەهۆی وەستان (وقف)ەوە هاتبوو، واتە لەبنەڕەتدا زەننەدار نیە.**

**ئەندازەی درێژکردنەوەی:**

**(٢) یان (٤) یان (٦) جووڵە درێژ دەکرێتەوە**

**نموونە:**

﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِی ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ (الفجر: ١٠)، ﴿كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّینِ ﴾ (الانفطار: ٩)

﴿یَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴾(البينة: ١٢)، ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ﴾ (آل عمران ١٤)

﴿إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔینَ﴾ (القصص ٨)

﴿ٱلَّذِینَ هُمۡ یُرَاۤءُونَ ﴾ (الماعون ٦)

## ٣- مەددی (اللين):

**بریتیە لەدرێژکردنەوەی هەردوو پیتی (و، ي)ی زەننەدار (ساکن) کاتێك پێشەوەیان (مفتوح) بێت و دوایان پیتێکی زەننەدار بێت بەهۆی وەستانەوە .**

**ئەندازەی درێژکردنەوەی:**

**(٢) یان (٤) یان (٦) جووڵە درێژ دەکرێتەوە**

نموونه :﴿ قرَيْش، علَيْه، البَيْت، خَوْف﴾

**مەددی (الصِّلة):**

**بریتیه له (هـ)ی ڕاناو (الضمیر) که بۆ تاکی نادیاری نێر دەگەڕێتەوە .**
**دەلکێت بەناو وکردارو پیتەوە:**
**وەکو: ﴿قُلتُهُ، حرِّقُوهُ﴾، ﴿أجَلِهِ، كمثلِهِ﴾، ﴿إليهِ، فيهِ، منهُ﴾**
**ئـەم ڕانـاوە لەبنەڕەتـدا (مـبني علـى الضـم)ە، بـەلاًم ئەگـەر (كسـرة) لەپێشیەوە بوو ئەویش (مكسور) دەبێت تەنها لەدوو شوێندا نەبێت کە لەریوایەتی (حفص)دا پێچەوانەیە:**

﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ﴾ (الكهف:٦٣)، ﴿عَلَيۡهُ ٱللَّهَ﴾ (الفتح: ١٠)

**مەددی (الصِّلة) دەکرێت بەدوو بەشەوە:**

**١- مـەددی (الصـلة)ی بچـووك: ئەگـەر پیتـی (همـزة) ی بـەدواوە نـەبوو، ئـەوە وەك مـەددی ئاسـایی (طبیعـي)یـەو دوو جووڵـە درێـژ دەکرێتـەوە، واتـە ئەگـەر ژێـری هـەبوو ئەنـدازەی پیتـی (ي)و، ئەگـەر بـۆری هـەبوو ئەندازەی پیتی (و) درێژ دەکرێتەوە.**
**لـە (مصـحف)دا لـەدوای ڕاناوەکـەوە (و) یْکـی بچـووك یـان (ي) یـەکی بچووکی بۆ دانراوە، وەکو:﴿ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٌ﴾**

**٢ – مەددی (الصلة)ی گەورە: ئەگەر پیتی (همزة)ی بەدواوە بوو.**

**ئەندازەی درێژ کردنەوەی: هەر وەك مەددی (منفصل) وایە (٤) یان (٥) جووڵـە درێـژ دەکرێتــەوە، هەرلەبەرئــەوەش پێــی وتــراوە: (الانفصــال الحكمي).**

**نموونە:**

﴿وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ﴾ (الليل ١١)، ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ (البلد ٧)

﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ﴾ (المطففين ١٢)

**تێبینی:**

**١- لـە سـێ شـوێنی قورئـانی پیرۆزدا (ه)ی ڕانـاو کەوتۆتـە نێـوان دوو پیتی بزواو بەڵام درێژ ناکرێتەوەو بەزەننە دەخوێنرێتەوە:**

﴿ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ ﴾ (الزمر ٧).

﴿ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ﴾ (النمل: ٢٨)

﴿قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ ﴾ (الأعراف: ١١١) ، (الشعراء:٣٦)

**سوود:**

**(ه)ی ڕاناو لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا درێژ ناکرێتەوە:**

**أ- ئەگەر کەوتە نێوان دووپیتی زەننەدارەوە، وەکو:**

﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ﴾ (البلد ١٠)

﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ ﴾ (البقرة ١٩٧)

**ب- ئەگەر پێشەوەی بزواو (متحرك) و دواوەی زەننەبوو، وەکو:**

﴿فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَكۡبَرَ﴾ (الغاشية ٢٤)

**ج- ئەگەر پێشەوەی زەننەو دواوەی بزواو بوو، وەکو:**

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ﴾ (القدر: ١)

**تێبینی:**

**١- لەیەك شوێنی قورئانی پیرۆزدا (ه)ی ڕاناو پێشەوەی زەننەدارو دواوەی بزواوەو دوو جووڵەش درێژ دەکرێتەوە:**

﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾ (الفرقان ٦٩)، **لەلای (حفص) بە (فيهي مُهانا) دەخوێنرێتەوە.**

**٢- (ه)ی (إسم الإشارة)ش هەمان حوکمی (ه)ی ڕاناوی هەیە:**

﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٌ﴾ (الانسان ٢٩)، **دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە چونکە پیتی (همزة) لەدوایەوە نەهاتووە .**

﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ (المؤمنون ٥٢)، **(٤) یان (٥) جووڵە درێژ دەکرێتەوە چونکە پیتی (همزة) لەدوایەوە هاتووە.**

﴿هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ (الطور ١٤)، **لێرەدا هیچ درێژ ناکرێتەوە چونکە دواوەی پیتێکی زەننەدارە.**

**بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا بەدوای ئەم (ه)یەدا پیتی (و) نەهاتووە.**

## پاشکۆی مەددەکان

### مەددی توانین (التمكين):

بریتیە لەهاتنی دوو پیتی (ي) بەشوێن یەکدا، یەکەمیان (شدّة) دارو (مكسور)ەو دووەمیان زەنندار.

هۆی ناونانی: چونکە بەهۆی (شدة)ەکەوە دەتوانرێت بەباشی بخوێنرێتەوە.

نموونە:

﴿ حُيِّيتم، النَّبيِّين، عِلِيِّين، الحوارِيِّين ﴾

ئەندازەی درێژکردنەوەی:

پێویستە (٢) جووڵە درێژ بکرێتەوە.[١٣٨]

### مەددی لەجیاتی (العوض):

بریتیە لەوەستان لەسەر (تنوين)ێکی (منصوب) لەکۆتایی وشەدا، بە ئەلیفێکی مەددی، واتە پیتی ئەلیفەکە لەجیاتی (تنوين)ەکە.

[١٣٨] إحكام الأحكام في تجويد القرآن ل ٢٢.

**ئەندازەی درێژکردنەوەی:**

**پێویستە (٢) جووڵە درێژ بکرێتەوە.**

**نموونە:**

**﴿ حكيمًا، عليمًا، كبيرًا ﴾**

**تێبینی: (ت)ی (تأنیث)ی خڕ (مربوطة) ئەگەر (تنوین)ی (فتحة)ی هەبوو بەپیتی (ه) لەسەری دەوەستی.**

**نموونە :﴿ رحمةً، نِعمةً ﴾.[١٣٩]**

**مەددی جیاکردنەوە (الفرق):**

**کاتێك هەمزەی پرسیار (إستفهام) دەچێتە سەر ناوێکی ناسێنراو بە (الـ)، ئەلیفی (ألـ)ی ناساندنەکە دەبێتە پیتی مەدد بۆ جیاکردنەوەی پرسیار (إستفهام)و هەواڵ (خبر).[١٤٠]**

**ئەم مەددەش تەنها لەسێ وشەی قورئانی پیرۆزدا ڕوویداوە:**

﴿ءَآللهُ﴾، ﴿ءَآلْـَٔـٰنَ﴾، ﴿ءَآلذَّكَرَيْنِ﴾

**ئەندازەی درێژکردنەوەی:**

**پێویستە (٦) جووڵە درێژ بکرێتەوە، چونکە جۆرێکە لەمەددی پێویستی وشەیی.[١٤١]**

---

[١٣٩] مذكرة في التجويد ل ١٥.

[١٤٠] إحكام الأحكام في تجويد القرآن ل ٢١.

[١٤١] كتاب الاضاءة فى بيان اصول القراءة ل ١٤.

**ڕیزبەندی مەددە لاوەکیەکان:** [١٤٢]

**مەددە لاوەکیەکان لەڕووی بەهێزی و لاوازیەوە جیاوازن بەپێی جیاوازی هۆکارەکانیان، واتە ئەگەر هۆکاری دروستبوونی مەددەکە بەهێز بوو مەددەکە بەهێزەو بەپێچەوانەشەوە ئەگەر هۆکارەکەی لاوازبوو مەددەکەش لاواز دەبێت، ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**١- بەهێزترینیان مەددی پێویست (لازم).**

**٢- مەددی لکاو (المتصل).**

**٣- مەددی تووشهاتو بەزەننە (العارض للسكون).**

**٤- مەددی جیا (المنفصل).**

**٥- مەددی گۆڕاو (البدل).**

**٦- لاوازترینیان مەددی (لین)ە.**

**کەواتە ئەگەر لەوشەیەکدا دوو هۆکار لەهۆکارەکانی مەدد کۆبوونەوە کار بەهۆکارە بەهێزەکەیان دەکرێت، بۆ وێنە:**

﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ﴾ **دوو هۆکاری مەددی تێدایە یەکەمیان مەددی (بدل) چونکە پیتی هەمزە پێش پیتی مەدد کەوتووە.**

---

[١٤٢] **بڕوانە: فتح رب البرية شرح المقدمة الجزرية ل ٣٧،تيسير الرحمن (٢٢٦-٢٣٠).**

**دووەمیان مەددی (لازم) چونکە پیتێکی زەننەداری بنەڕەتی بەدوای پیتی مەددا هاتووە، لێرەدا کار بەلاوازەکە ناکرێت کە مەددی (بدل)ە، بەڵکو کار بە هۆکارە بەهێزەکە دەکرێت کەمەددە (لازم)ەکەیە.**

**﴿بُرَءَٰٓؤُا﴾ لێرەشدا دوو جۆر مەدد هەیە، (بدل)و پێویستی لکاو (واجب متصل) بۆیە کار بە پێویستە لکاوەکە دەکرێت و، لەبەر لاوازیی، (بدل)ەکە فەرامۆشدەکرێت.**

**(السّمنودي) دەڵێت:**

أَقْوَى المُدودِ لازمٌ فَمَا اتَّصَلْ  فعَارِضٌ فَذُو انْفِصَالٍ فَبَدَلْ

وَسَبَبَا مَدٍّ إذا مَا وُجِدَا  فَإِنَّ أَقْوَى السَّبَبَيْنِ انْفَرَدَا

**(ابن الجزري) بەم نیو دێڕە ئاماژەی پێکردووە:**

.................. وأقْوَى السَّبَبَيْن يَسْتَقِلْ

**تێبینی: لەکاتی خوێندنی قورئانی پیرۆزدا پێویستە مەددە هاوشێوەکان وەك یەك درێژبکرێنەوە، بۆنموونە مەددی (جائز منفصل) ئەگەر یەکەمیان (٤) جووڵە بوو دەبێت تا کۆتایی خوێندنەکە لەسەر (٤) جووڵە بەردەوامبیت، هەروەها مەددی توشهاتوو بەزەننەش دەبێت لەسەر(٢) یان (٤) یان(٦) جووڵە تاکۆتایی خوێندنەکە لەسەری بەردەوامبیت.**[١٤٣]

**(ابن الجزري) لەمبارەیەوە دەڵێت:**

---

[١٤٣] **بڕوانە : هداية القاري ل ١٤٢.**

.................. والنَّفْظُ في نظِيرِهِ كَمِثْلِهِ

## بەشی نۆیەم

## وەستان و دەستپێکردن ( الوقف والابتداء )

وەستان (الوقف)و، دەستپێکردن (الإبتداء) بەیەکێك لەبەشە هەرە گرنگەکانی زانستی (تجوید) دادەنرێت چونکە بەهۆیەوە واتاو مەبەستی ئایەتەکان بۆ خوێنەرو بیسەر ڕووندەبێتەوە.

پێشەوا (علي) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لەڕاڤەی ئایەتی ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلاً ﴾ (المزمل ٤)

فەرموویەتی: هو تجوید الحروف، ومعرفة الوقوف.[١٤٤]

واتە: چاك خوێندنەوەی پیتەکان و زانینی وەستانەکانە.

(ابن الجزري)یش دەڵێت:

وَبَعْدَ تَجْوِيْدِكَ لِلْحُرُوفِ لاَبُدَّ مِنْ مَعْرِفَةِ الْوُقوفِ

والِابتداء ............. .......................

---

[١٤٤] الإتقان في علوم القرآن للسيوطي (١/٢٢١).

## یەکەم: وەستان (الوقف):

**پێناسەی وەستان (الوقف): بریتیە لە بچڕاندنی دەنگ و وەستان لەسەر کۆتایی وشەیەك، بەو مەرجەی هەناسە وەرگرێ و نیازی دەستپێکردنەوەی هەبێت.**

**بەشەکانی وەستان (الوقف):**

**وەستان دەکرێت بە (چوار) بەشی سەرەکیەوە:**

**یەکەم : وەستانی ناچاری (وقف اضطراري):**

**بریتیە لەوەستانی خوێنەر بەهۆی هەناسە تەواو بوونەوە یا تەنگە نەفەسیەوە یا پژمەو کۆکەو هەرشتێکی تر لەوبابەتانە.**

**ئەم جۆرە وەستانەش لەهەموو کاتێکدا دروستە، بەڵام چاکتر وایە کەخوێنەر تابۆی دەکرێ وشەی گونجاو هەڵبژێرێ بۆ وەستانەکەی. لەکاتی دەستپێکردنەوەشدا ئەگەر وشەی دوای وەستانەکە گونجاو بوو لەوێ وە دەست پێدەکاتەوە ئەگەر نا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی گونجاوە بۆ دەست پێکردنەوە.**

**دووەم: وەستانی تاقیکردنەوە (اِختباري):**

وەستانە لەسەر وشەیەکی قورئانی پیرۆز کە لە بنەڕەتدا شوێنی وەستان نیە، بەڵکو تەنها بۆتاقیکردنەوەو فێرکردنی قورئانخوێنە لەلایەن مامۆستاکەیەوە تا شێوازی وەستان لەسەر ئەو وشەیە فێربێت.

بۆ نموونە: وەستان لەسەر وشەی (حَاضِرِي) لە ئایەتی :﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمۡ يَكُنۡ أَهۡلُهُۥ حَاضِرِي ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ﴾ (البقرة:١٩٦)

لەکاتی وەستاندا پێویستە پیتی(ي) کەی بخوێنێتەوەو، لەکاتی بەردەوامبوونیشدا پێویستە پیتی ناوبراو نەخوێنێتەوە.

## وەستانی چاوەڕوانی (الوقف الإنتظاري):

لەکاتی خوێندنەوە بەکۆکردنەوەی قیرائات (جمع القراءات) بۆ دەرهێنانی هەموو شێوە (وجە)کان. [١٤٥]

## وەستانی ئارەزوو (اِختياري):

بریتیە لەوەستانی خوێنەر بەویست و حەزی خۆی، ئەمیش لەسەر ڕای زۆرێك لەزانایان، وەك پێشەوا (الداني) و (ابن الجزري) دەکرێت بە چوار بەشەوە:

١- وەستانی تەواوتر (تام).
٢- وەستانی تەواو (كافي).
٣- وەستانی باش (حسن).
٤- وەستانی ناشیرین (قبيح).

---

[١٤٥] ( د. دیاری)

**١- وەستانی تەواوتر (تام): وەستانە لەسەر ڕستەیەکی تەواو کە هیچ پەیوەندیەکی بەپاش خۆیەوە نیە نە لە ڕووی واتاو نە لە ڕووی (إعراب)ەوە. ئەمیش دوو جۆرە:**

**أ- وەستانی پێویست (لازم): وەستانە لەسەر وشەیەك ئەگەر بگەیەنرێ بەوەی دوای خۆی مانای ئایەتەکە دەشێوێ، بۆیە وەستان لەسەری پێویستە.**

**نموونە:**

﴿إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَۘ وَٱلۡمَوۡتَىٰ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ﴾ (الأنعام:٣٦)

﴿فَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّا نَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ (يس:٧٦)

﴿أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ﴾ (أعراف:١٨٤)

**لێرەشدا وەستان لەسەر وشەی (يتفكّروا) پێویستە با لە (مصحف)یشدا نیشانەی وەستانی پێویستی بۆ دانەنرابێت، بۆئەوەی پیتی (ما) ببێتە (نافية)، چونکە لەکاتی نەوەستاندا دەبێتە (موصولة)و مانای ئایەتەکە دەگۆڕێت.**[١٤٦]

﴿لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةً وَأَصِيلاً﴾(الفتح:٩)

**هەروەها لێرەشدا وەستان لەسەر وشەی (وتوقّروه)پێویستە، بۆ جیاکردنەوەی هەردوو ڕاناوی (هاء)ی لەیەکتر، چونکە ڕاناوی**

---

[١٤٦] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ٢٩٣

(وتُوَقّروه) بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگەڕێتەوەو، ڕاناوی (هاء)ی (وتسبّحوه) بۆ خوای گەورە دەگەڕێتەوە.[١٤٧]

نیشانەی لە (مصحف)دا: زانایان بۆ ئەم جۆرە وەستانە سەرە پیتی میمیان(مــ) بەبچــووکی بەنیشــانە بــۆ دانــاوەو بــەمیمی خەنجــەری دەناسـرێت، وەك نموونـەکانی سـەرەوە، ئـەم جـۆرە وەسـتانە (البیـان التام)یشی پێدەوترێت.

ب- وەستانی تەواوی ڕەها (التام المطلق):

وەستان لەسەری سوننەتەو بەردەوامبوونیش (وصل) ڕێپێدراوە.

وەکو وەستان لەسەر کۆتایی زۆربەی ئایەتەکان ، کۆتایی چیرۆکەکان.

نیشانەکانی ئەم وەستانە:[١٤٨]

زۆر جار یەکێك لەمانەی خوارەوە بەدوایدا دێت:

- پرسـیار (اسـتفهام)، وەك: ﴿ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ۝٦٩ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ (الحج ٦٩-٧٠)
- پیتــی (یــا النــداء) وەك: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٢٠ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ (البقرة:٢٠-٢١)

---

[١٤٧] بڕوانە: حق التلاوة ل ١٠٢- ١٠٣.

[١٤٨] بڕوانە: تیسیر الرحمن ٢٩٥.

- ئـــامرازی مـــەرج (شـــرط)، وەك : ﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ ...﴾ (النساء : ١٢٣)

- داخـوازی (فعـل الأمـر)، وەك : ﴿ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ (هود:١١٤-١١٥)

- جیاکردنەوەی ئایەتی سزا لە ئایەتی بەزەیی وەك:

﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ (البقرة:٢٤-٢٥)

- لادان لەهەواڵـــەوە بـــۆ چـــیرۆك وەك : ﴿وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ١٥٩ وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ﴾

**نیشانەی لە (مصحف)دا: زۆر جار نیشانەی (قلـی)ی بۆ دانـراوە، واتـە: وەستان باشترە لەبەردەوامبوون، بەردەوامبوونیش دروستە .**

**سوود: وەستانی جبریل (وقفُ جبريل) سەر بەم بەشەیەو، وەستان لەسەری سوننەتە، چونکە (جبریل) سەلامی خوای لێبێت لەسەری وەستاوە، هەروەها پێغەمبەریش ﷺ لەکاتی وتنەوەیدا وەستاوە.**
**ئەم وەستانەش لە (١٠) شوێنی قورئانی پیرۆزدایە :** [١٤٩]
**بۆ دەستنیشانکردنی نیشانەی (۞)م بۆداناوە.**

١- ﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُواْ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ۞ أَيْنَ مَا تَكُونُواْ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ ﴾ (البقرة:١٤٨)

٢- ﴿قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ۞ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ (آل عمران:٩٥)

٣- ﴿وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُواْ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ۞ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ﴾ (المائدة:٤٨)

٤- ﴿قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ ۚ۞ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ ﴾ (المائدة:١١٦)

٥- ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ۚ ۞ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي ۖ ﴾ (يوسف:١٠٨)

٦- ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ۞ (١٧) لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ ﴾ (الرعد:١٧)

---

[١٤٩] بڕوانە: حق التلاوة ل ١٠٥.

٧- ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ٤ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۖ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴾ (النحل:٤)

٨- ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ﴾ (السجدة:١٨)

٩- ﴿ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ ٢٢ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ٢٣﴾ (النازعات:٢٢-٢٣)

١٠- ﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا﴾ (القدر:٣-٤)

**٢- وەستانی تەواو (كافي): وەستانە لەسەر ڕستەیەك لەخودی خۆیدا مانای تەواو دەبەخشێت و، تەنها لەڕووی واتاوە پەیوەندی بەدوای خۆیەوە هەیە نەك لەڕووی (إعراب)ەوە.**

**حوكمی ئەم وەستانە: وەستان و بەردەوامبوون وەك یەك پەسەندكراوە.**

**وەكو وەستان لەسەر وشەی (الْبَيْتِ) لە ئایەتی:** ﴿فَلْيَعْبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ۝٣ ٱلَّذِيٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفِۭ ۝٤﴾ (قريش ٣-٤)

**نیشانەكانی وەستانی (كافي):**

**زۆر جار یەكێك لەمانەی خوارەوە بەدوایدا هاتووە:**[١٥٠]

- **(مبتدأ) وەك :** ﴿وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ۝١٤ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ۖ﴾ (البقرة:٨٥)
- **(فعل) وەك:** ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ (المائدة:٩٥)
- **(مفعول به) (فعل)ێكی (محذوف) وەك :**﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝٣٠ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ﴾ (الروم:٣٠)
- **(نفي) یان (استفهام) وەك:** ﴿فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ۝٧٧ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ﴾ (التوبة:٧٧)

---

[١٥٠] بڕوانە: **أضواء البيان في معرفة الوقف والأبتداء ، جمال إبراهيم القِرش ل ١٥- ١٦.**

- (إنِ)ی ژێردار (مكسورة) وەك:﴿أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ جُندٞ لَّكُمۡ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ إِنِ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ﴾ (الملك:٢٠)
- (بَل) وەك: ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَقَلِيلٗا مَّا يُؤۡمِنُونَ ٨٨﴾ (البقرة:٨٨)
- (لا) وەك: ﴿وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ٣٩ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ﴾ (يس:٣٩)
- (سين) و (سوف)، وەك: ﴿أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ﴾ (الزخرف:١٩)
- (نعم) و (بئس) وەك : ﴿ وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ (ص:٣٠)

**نیشانەی وەستانی (كافي): زۆر جار لە (مصحف)دا نیشانەی (ج)ی بۆ دانراوە، واتە: وەستان و نەوەستان وەك یەكن.**

**٣- وەستانی باش (حسن): وەستانە لەسەر وشەیەك مانای تەواوبێت بەڵام لەڕووی ماناو (إعراب)ەوە پەیوەندی هەیە بە پاش خۆیەوە.**

**حوکمی ئەم وەستانە: وەستان لەسەری باشە، بەڵام باش وایە بەوەی کەبەدوای وەستانەکەدا دێ دەست پێنەکەیتەوە، بەڵام ئەگەر کۆتایی ئایەت بوو ئاساییە. وەکو:**

**وەستان لەسەر (الْحَمْدُ للّهِ)ی سورەتی (الفاتحة) کەوەستانێکی جوانە، بەڵام دەست پێکردن بە (رَبِّ الْعَالَمِينَ) دەستپێکرنێکی ناشیرینە.**

**نیشانەی وەستانی جوان:**

**زۆربەی جار زانایان لە(مصحف)دا نیشانەی (صلی)یان بۆ داناوە، لەکاتێکدا ئەگەر دەستپێکردن بەدوای وەستانەکەوە دروستبێت.[١٥١]**

**(ابن الجزري) سەبارەت بەم سێ جۆرە وەستانە دەڵێت:**

....... وَهْيَ تُقْسَمُ إِذَنْ ثَلاَثَةً تَامٌ وَكَافٍ وَحَسَنْ

وَهْيَ لِمَا تَمَّ فَإِنْ لَمْ يُوجَدِ تَعَلُّقٌ أَوْ كَانَ مَعْنًى فَابْتَدِي فَالتَّامُ

فَالْكَافِي وَلَفْظًا فَامْنَعَنْ إِلَّا رُؤُوسَ الآيِ جَوِّزْ فَالْحَسَنْ

---

[١٥١] بڕوانە: أضواء البيان في معرفة الوقف والأبتداء، جمال إبراهيم القِرش ل ١٨.

**٤- وەستانی ناشیرین (قبیح): وەستانە لەسەر وتەیەك لەخودی خۆیدا واتای تەواو نابەخشێت، لەبەر پەیوەست بوونی بەپاش خۆیەوە لەڕووی وشەو ماناشەوە، لەبەر ئەوە مانایەکی بێمەبەست یان خراپ دەگەیەنێت.**

**حوکمی ئەم وەستانە : دروست نیە لەکاتی ناچاریدا نەبێ، وەك : کۆکەو پژمەو هەناسەتوندی، لەم حاڵەتەشدا پێویست(واجب)ە لەکاتی دەست پێکردنەوەدا بگەرێیتەوە بۆ پێش وەستانەکە بۆئەو شوێنەی مانای تەواو دەبەخشێ.**

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

وَغَيْرُ مَا تَمَّ قَبِيـحٌ وَلَهُ الْوَقْفُ مُضْطَرًّا وَيَبْدَا قَبْلَه .

**وەستانی (قبیح) چوار شێوەی هەیە:**[١٥٢]

**١- دەقەکە پیرۆزەکە والێ دەکات کەهیچ واتایەك نەبەخشێ، وەکو :**

**وەستان لەسەر (وَهَلْ أَتَاكَ)ی ئایەتی**﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾ (طه ٩)

**وەستان لەسەر (اسْمَ) ئایەتی** ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ (الأعلى ١)

**٢- واتایەك دەبەخشێت کە پەروەردگار مەبەستی ئەو واتایە نیە، وەك وەستان لەسەر وشەی (والموتى)ی ئایەتی:**

﴿إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَ وَٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ (الأنعام:٣٦)

---

[١٥٢] بڕوانە: تيسير الرحمن ل ٢٩٩.

**یـان وەسـتان لەسـەر وشـەی (الصَّلاَةَ)ی ئایـەتی:** ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ (النساء ٤٣)

**٣- وەسـتان لەسـەر وشـەیەك كەواتاكـەی شایسـتە نـەبێت بـەخوای پەروەردگار، یان واتایەك بگەیەنێ كەپێچەوانەی بیرو باوەڕی ئیسلامی بێت، وەكو:**

**وەسـتان لەسـەر وشـەی (لا يَهْـدِي) ئایـەتی:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِى ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَـٰسِقِينَ﴾ (المنافقون ٦)

**وەستان لەسەر (لا يَسْتَحْيِي) ئایەتی:** ﴿وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡىِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ (الأحزاب ٥٣)

**٤- وەستانی زۆر لەخۆكردن (التعسّف): ئەم جۆرەش هەندێ لە بەناو قوڕئانخوێنـەكان بـەناڕەوایی تێیـدا دەوەسـتن، وەك وەسـتان لەسـەر وشەی (فلا جناحَ) وپاشان دەستپێكردن بە (علیه ...)**

**لەئایـەتی:** ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ﴾ (البقرة:١٥٨)

**یـان وەسـتان لەسـەر (لا تُشـرك) لـە ئایـەتی:** ﴿وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَـٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٌ﴾

## دووەم: دەستپێکردن (الابتداء)

**دەستپێکردن: بریتیە لەدەستپێکردنەوەی خوێندن پاش بچڕان یان وەستان لەخوێندن، دەستپێکردنەوەش بەویستی خوێنەرەو ناچاریی تێدا نیەو، دەکرێت بە دوو بەشی سەرەکیەوە:**

**دەستپێکرنی دروست (الابتداء الجائز)**

**دەستپێکردنە بەواتایەك لەخودی خۆیدا سەربەخۆیەو واتایەك ڕووندەکاتەوە پێچەوانە نیە لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە ویستوویەتی. ئەمیش دەبێت بە سێ بەشەوە:**

**١- دەستپێکرنی تەواوتر (الابتداء التام): دەستپێکردنێکە بەدوای وەستانی (تام)دا دێت، یان دەستپێکردنێکە هیچ پەیوەندیەکی بە پێش خۆیەوە نیە نە لەڕووی (إعراب)و نە لەڕووی واتاشەوە .**
**وەك: دەستپێکردن بە: سەرەتای سوڕەتەکان، چیرۆکەکان، ئایەتەکانی ئەحکام، سیفاتی ئیمانداران یان بێباوەڕان یان دووڕووان، سەرەتای باسکردنی بەهەشت یان دۆزەخ.[١٥٣]**

**٢- دەستپێکرنی تەواو (الإبتداء الكافي): دەستپێکردنێکە بەدوای وەستانی (كافي)دا دێت، یان دەستپێکردنە بەڕستەیەك کەواتایەکی تەواو دەبەخشێت بەڵام هەر لەڕووی واتاوە پەیوەندی بەپێش خۆیەوە هەیە، وەك:**

[١٥٣] مذكرة في التجويد ل ٢٥.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ﴾ (البقرة:٥)

﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ﴾ (البقرة:١٠)

**٣- دەستپێکرنی باش (الابتداء الحسن): دەستپێکردنێکە بەدوای وەستانی (باش)دا دێت، یان دەستپێکردنە بەڕستەیەك لەڕووی ماناو (إعراب)ەوە پەیوەندی هەیە بە پێش خۆیەوە.**

**وەك دەستپێکردن بە (مِن قبلُ) لەئایەتی:**

﴿...وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ۝٣ مِن قَبۡلُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ﴾

(آل عمران: ٣-٤)

**دەستپێکردن بە (مَن يقولُ) لەئایەتی :**

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ﴾(البقرة:٨)

**دەستپێکرنی ناشیرین (الإبتداء القبیح):**

**دەستپێکردنە بەڕستەیەك کەهیچ مانایەك نابەخشێ یان دەیشێوێنێ یان مانایاك دەبەخشێ کە خوای گەورە مەبەستی نیە، بۆیە پێویستە لەسەر قوڕئان خوێن خۆی لەمجۆرە دەستپێکردنانە بپارێزێت هەرچەندە بەمەبەستی خراپیشەوە نەبێت.**

**بۆ نموونە دەستپێکردن بە:**

﴿أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾**ی ئایەتی** ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾ (المسد:١)

﴿ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا﴾ **لەئایەتی** ﴿قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ﴾ (یونس:٦٨)

# وەستان (السَّكت)

**السكت : وەستان یا بێدەنگبوون لەسەر وشەیەکی قورئانی پیرۆز بۆ ماوەیەکی کەم (٢جووڵە) بەبێ هەناسە دان .[١٥٤]**

**شوێنەکانی (السّکت) لە قورئانی پیرۆزدا:**

**لەریوایەتی (حفص) لە (عاصم)ەوە لەڕێگای (الشاطبية)وە چوار (سکتة)ی پێویست (واجب) هەن کە ئەمانەن:**

**١- (سکتة) لەسەر پیتی ئەلیفی وشەی (عِوَجَا) لە ئایەتی**﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ۝١ قَيِّمٗا...﴾(الكهف١-٢)

**ئەمەش لەحاڵەتی بەردەوامبووندا، ئەگینا وەستان لەر وشەی (عِوَجَا) دروستە چونکە کۆتایی ئایەتە.**

**٢- (سکتة) لەسەر پیتی ئەلیفی وشەی (مَرْقَدِنَا) لە ئایەتی:**

﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ (يس:٥٢)

**لێرەدا وەستانی تەواو (الوقف التام)یش دروستە .**

**٣- (سکتة) لەسەر پیتی نونی وشەی (مَن) لە ئایەتی:**﴿وَقِيلَ مَنۜۡ رَاقٖ﴾ (القيامة ٢٧)

---

[١٥٤] بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد ل ١٢٣.

**٤- (سكتة) لەسەر پیتی لامی وشەی (بَلْ) لە ئایەتی** ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين ١٤)

**نیشانەی (سكتة) لە (مصحف)دا:**

**زانایان پیتی (س)یان بەبچووكی لەسەر پیتی كۆتایی وشەكە بە نیشانە بۆ داناوە.**

**پێشەوا (الشاطبي)یش بەدوو دێر ئاماژەی بۆ (سكتة)كانی (حفص)كردووە.[١٥٥]**

وَسَكْتَةُ حَفْصٍ دُونَ قَطْعٍ لَطِيفَةٌ   عَلَى أَلِفِ التَّنْوِينِ فِي عِوَجاً بَلاَ
وَفِي نُونٍ مَنْ رَاق وَمَرْقَدِناَ وَلاَ   مِ بَلْ رَانَ وَالْبَاقُونَ لاَ سَكْتَ مُوصَلاَ

**هەروەها دوو (سكتة)ی تریش لە (حفص)ەوە ریوایەت كراوە بەڵام پێویست (واجب) نین بەڵكو ڕێپێدراو (جائز)ن :**

**١- (سكتة)ی نێوان سورەتی (الأنفال) و(التوبة)، كە یەكێكە لەسێ شێوازی گەیاندنی ئەم دوو سورەتە بەیەكەوە، واتە: بچڕاندنی هەردووكیان و، گەیاندنی هەردووكیان بە بێ وەستان و بەبێ (سكتة)، (سكتة) لەنێوانیاندا.**

**٢-(سكتة) لەسەر پیتی های وشەی (مَالِيه) لە ئایەتی:**
﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَـٰنِيَهْ﴾

[١٥٥] **بڕوانە: إبراز المعاني من حرز الأماني لأبي شامة ل (٢/٢٤٥).**

**لێرەشدا خوێندنەوەی بە (سكتة)و بەبێ (سكتة) دروستە بەڵام (سكتة)كە لەپێشترە، بەڵام ئەگەر بەبێ (سكتة) خوێنرایەوە پێویستە هەردوو پیتی (ه) تێهەڵكێش بكرێن، چونكە تێهەڵكێشی لێكچووی بچووكن.[156]**

---

[156] **بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ٣٠٤.**

# نیشانەکانی وەستان

مـ: نیشانەی وەستانی (لازم).

قلی: نیشانەی وەستانی ڕێپێدراو، بەڵام وەستان (وقف) چاکترە.
واتە: (التام المطلق)

ج: نیشانەی وەستانی ڕێپێدراو، (وەستان و بەردەوام بوون وەك یەكن).
واتە: (الوقف الكافي)

صلی: نیشانەی وەستانی ڕێپێدراو، بەڵام بەردەوام بوون (وصل) چاکترە.
واتە: (التام المطلق)

لا: نیشانەی وەستانی قەدەغە.
واتە: (الوقف القبیح)

∴ ∴ ئەگەر لەسەر یەكێك لەم دوو نیشانەیە بوەستی لەسەر ئەوی تریان ناوەستی، دەشتوانی لەسەر هیچ کامیان نەوەستی. پێی دەوترێت (وقف التعانق) یان(وقف المراقبة) (٣٥) جار لە قورئاندا هاتووە [١٥٧]

---

[١٥٧] بڕوانە: إحكام الأحكام ل ٢٦.

# وەستان لەسەر کۆتایی وشەکان

قورئان خوێنی بەڕێز، دەتوانی بەسێ شێوە لەسەر کۆتایی وشەکانی قورئانی پیرۆز بوەستی:[١٥٨]

١- زەننەی ڕووت (السكون المحض).

ئەم شێوەیە بنەڕەت( أصل)ە لەوەستاندا، چونکە عەرەب لە قسەکردندا بە زەننە (ساكن) دەستپێناکەن و لەسەر بزواو (متحرّك)یش ناوەستن.

٢- الرَّوم.

دەربڕینی بەشێك لە جووڵە (حركة)ی کۆتایی وشەکە، بەشێوەیەك کەسی نزیکی گوێگر بیبیستێ و کەسی دوور نەیبیستێ.

مەبەست لەجووڵە (ضمّة) و(كسرة)یەو هیچ جیاوازیەك نیە ئەگەر وشەکە (مبني) یان (مُعرب) بێت.

هەندێك لەزانایان دەڵێن دوو لەسەر سێی جووڵە (حركة)ی پیتەکە دەمێنێتەوە.

تێبینی: لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا (رَوم) قەدەغەیە:

أ- ئەگەر کۆتایی وشەکە سەر (فتحة) بوو.

ب- لەمیمی کۆ (جمع)دا، وەك: (عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ)، تەنها بەزەننە لەسەری دەوەستیت.

---

[١٥٨] بڕوانە: فتح رب البريّة ل ٥٨- ٥٩.

ت- (هاء التأنيث) يان (التاء المربوطة) چونكه لەسەری بوەستی دەبیتە پیتی (ه)، وەك: (لَكَبِيرَةٌ).

ث- های ڕاناو (هاء الضمير) لەسەر ڕای بەهێزی زانایان، وەك: (عَلَيْهِ)، (إِنَّهُ).

ج- ژێر (كسرة)ی كاتی (عارض)، وەك:
(أَمِ ارْتَابُواْ)، تەنها بە زەننە لە سەری دەوەستیت چونكە (كسرة)كەی بنەڕەتی (أصلي) نیە.

٢- الإشمام.

كۆكردنەوەی لێو پاش زەننە (ساكن) كردنی پیتە بۆر (ضمّة) دارەكە بەبێ دەربڕینی دەنگ، بەشێوەیەك چاوساغ دەیبنێ وكوێر نایبینێ.
واتە شێوەی هەردوو لێو وەك شێوەی دەربڕینی پیتی واوی لێدێ . كەواتە (إشمام) شێوازە نەك دەنگ .

سوودی (رَوم)و (إشمام):[١٥٩]

ڕوونكردنەوەو دەرخستنی جوولە (حركة)ی بنەڕەتی (أصلی) وشەكەیە بۆ بیسەر لەحاڵەتی (رَوم)داو، بۆ بینەریش لەحاڵەتی (إشمام)دا .

[١٥٩] تیسیر الرحمن ل ٢٣٨، أحكام قراءة القرآن للحصري ل ٢٣٦.

**تێبینی:**

**یەکەم: (إشمام) حوکمی وەستان لەسەر زەننە (الوقف بالسکون)ی هەیە، هەر بۆیە لەگەڵیدا مەددی توشهاتوو بەزەننە (العارض للسکون) درێژدەکرێتەوە بەمەرجێ پیتی کۆتایی وشەکە بۆر (ضمة)دار بێت.**

**دووەم: سەبارەت بە وشەی ﴿لَا تَأْمَنَّا﴾ (یوسف: ١١) لەریوایەتی(حفص)دا پێویستە بە (إشمام) یان بە (رَوم) بخوێنرێتەوە، بۆیە لەسەر قورئان خوێن پێویستە لە دەمی مامۆستایانی شارەزاو مۆلەت پێدراوەوە فێری ببێت.**[١٦٠]

**سێیەم: (رَوم)یش حوکمی گەیاندن (وصل)ی هەیە، بۆیە مەددی توشهاتوو بەزەننە (العارض للسکون) لەگەڵیدا درێژناکرێتەوە.**[١٦١]

**چوارەم: ئەگەر کۆتایی وشەکە (تنوین)ی (ضمّة)و (کسرة)بوو لەکاتی (رَوم)دا (تنوین)ەکە لادەبەین و بە بەشێکی (ضمّة)یان(کسرة)کە لەسەری دەوەستین.**[١٦٢]

**(ابن الجزري) دەڵێت:**

وَحَاذِرِ الْوَقْفَ بِكُلِّ الْحَرَكَهْ إِلاَّ إِذَا رُمْتَ فَبَعْضُ الْحَرَكَهْ

إِلاَّ بِفَتْحٍ أَوْ بِنَصْبٍ ، وَأَشِمّ إِشَارَةً بِالضَّمِّ فِي رَفْعٍ وَضَمّ

---

[١٦٠] وانەکانی د. أیمن سوید.

[١٦١] هەمان سەرچاوە.

[١٦٢] هەمان سەرچاوە.

# بڕین ( القطع )

(القطع): واته لێبوونەوەو كۆتایهێنان به قوڕئان خوێندن و دەستكردن بەكارێكیتر.

پێویسته لەسەر قوڕئان خوێن لەو شوێنەدا كۆتایی به خوێندنەكەی بێنێت كه مانای تەواو دەبەخشێت و، بۆی نیه خۆی پاپەندكا بەو نیشانانەی كه دانراون له كۆتایی (جزء)و (حزب)و (نصف الحزب)و... هتد.

چونكه مەرج نیه ئەونیشانانه لەو شوێنانەدا دانرابن كەمانایان تەواوبێت، بەڵكو زانایان دایانناون بۆ دابەشكردنی قوڕئانی پیرۆز بەسەر (جزء) و (حزب)و ... هتد.

بۆ نموونه كۆتایی (جزء)ی (٤) پەیوەسته بەسەرەتای (جزء)ی (٥) واته ئایەتی (٢٤)ی سوڕەتی (النساء) چونكه تەواوكەره بۆ ئایەتی پێشوو كه باسی ئەو ئافرەتانه دەكات كه خوازبێنیكردنیان قەدەغەكراوە، بۆیه باش وایه ئەو ئایەتەشی لەگەڵدا بخوێنرێت.

هەروەها:

(جزء)ی (١٢): چاكتر وایه به ئایەتی (٥٣)ی سوڕەتی (یوسف) كۆتایی بەخوێندنی(جزء)ی (١٢) بهێنێت .

(جزء)ی (١٩) باشتر وایه بەتەواوبوونی چیرۆكی پێغەمبەر (لوط) كۆتایی بەخوێندنەكەی بهێنێت نەك لەكۆتایی ئایەتی (٥٥)دا.

(جزء)ی (٢١)یش به خوێندنی ئایەتی (٣١)ی سوڕەتی (الأحزاب) كۆتایی بەخوێندنەكەی بهێنێت .

(جزء)ی (٢٢)یش بە خوێندنی ئایەتی (٢٩)ی سوڕەتی (یس) کۆتایی بەخوێندنەکەی بهێنێت.
(جزء)ی (٢٤)یش بە خوێندنی ئایەتی (٤٧) سوڕەتی (فصلت) کۆتایی بەخوێندنەکەی بهێنێت.
(جزء)ی (٢٥)یش بە خوێندنی هەموو سوڕەتەکە (الجاثیة) کۆتایی بە خوێندنەکەی بهێنێت.
(جـزء)ی (٢٦)یـش بـە خوێنـدنی ئایـەتی (٣٧) سـوڕەتی (الـذاریات) کۆتایی بەخوێندنەکەی بهێنێت.
سـەبارەت بـە (حـزب)و بەشەکانیشـی نموونـەکان زۆر لـەوە زیـاترن کەلێرەدا باسیان لێوەبکرێت.[١٦٣]

[١٦٣] حق التلاوة ل ١٢٩–١٣٠، بەدەسکاریەوە.

# دەنگ بەرزکردنەوە ( النَّبْر )

**النبر: لەزمانەوانیدا: دەنگ بەرزکردنەوەو هاواری توند.**

**لەزاراوەشدا: دروستکردنی فشارێکی زیادە لەسەر پیت.**

**حاڵەتەکانی (النبر) لەقوڕئانی پیرۆزدا:**

**١- لەکاتی وەستان لەسەر پیتی (شدّة)دار.**

**وەك: (مُسْتَقِرٌّ، أَضَلُّ، الْمَسّ)**

**هۆکاری: بۆ ئەوەی گوێگر هەستبکات کەپیتە (شدّة)دارەکە دووپیتە.**

**بەڵام ئەم دوانەی خوارەوە ناگرێتەوە:**

**یەکەم: پیتەکانی (قلقلة) ئەگەر (شدّة)دار بوون:**

**(وَتَبَّ، الْحَجِّ، الْحَقُّ )**

**ئەمانە (قلقلة)یان پێدەکرێت و پەیوەندیان بە (نَبر)ەوە نیە.**

**دووەم: نون و میمی (شدّة)دار:**

**(وَلاَ جَآنٌّ، عَمَّ، لَكِنَّ)**

**ئەم دوو پیتەش مینگە هاوەڵایەتیاندەکات.**

**٢- لەکاتی وەستان لەسەر پیتی (همزة) دا:**

**(السَّمَآءِ، وَجِيءَ، السُّوءُ، شَيْءٍ، السَّوْءِ )**

**هۆکاری: نەفەوتانی پیتی (همزة) بەهۆی سەرقاڵبوونی دەم بە دەرکردنی پیتی مەددەوە.**

٣- گواستنەوە لەپیتی مەددەوە بۆ پیتێکی (شدّة)دار.
(الضَّآلِّينَ، وَالصَّآفَّاتِ، حَآدَّ )
هۆکاری: تیانەچوونی پیتە (شدّة)دارەکە بەهۆی سەرقاڵبوونی دەم بە دەرکردنی پیتی مەددەوە، بۆ ئەوەی گوێگر هەستبکات کە پیتە (شدّة)دارەکە دووپیتە.

تێبینی: ئەگەر پێش پیتەکانی (قلقلة) پیتی مەددی پێویست (لازم) هاتبوو ئەوا (نبر) پێویست (واجب) دەبێت لە حاڵەتی وەستان بەردەوامبوونیشدا. وەك: ﴿الدَّوَآبِّ، يُشَآقِّ، حَآدَّ ﴾

٤- لە کاتی کەوتنی ئەلیفی دووکەسدا (ألف الاثنين) بەهۆی گەیشتنی دوو (ساکن) بەیەك (نبر) پێویست دەبێت، ئەگەر لەگەڵ تاك (مفرد)دا جیانەدەکرایەوە، بۆئەوەی گوێگر هەست بەپیتی ئەلیفەکە بکات، لێرەدا (نبر) تەنها لەحاڵەتی بەردەوامبوون (وصل)دا پێویستە.
وەك: (ذَاقَا الْشَّجَرَةِ، وَاسْتَبَقَا الْبَابَ، وَقَالاَ الْحَمْدُ للهِ).
بەلاّم ئەگەر لە تاك (مفرد)جیا کرایەوە ئەوا پێویستی بە (نبر) نابێت، وەك: ( دَعَوَا اللهَ، ادْخُلاَ النَّارَ).

٥- لەکاتی دەربڕینی پیتی (و)و (ي) (شدة)داردا، لەحاڵەتی وەستان و بەردەوامبووندا وەك: (تَوَّاباً، نَبِيًّا، عَصَواْ وَّقَالُواْ، عَدُوٌّ، النَّبِيُّ )
هۆکاری: تێکەڵنەبوونی (و)و (ي) (شدة)دار لەگەڵ (و)و (ي) مەددو (لين)دا.[164]

[164] بڕوانە: مذكرة في أحكام التجويد ل ٢٦، فتح رب البرية شرح المقدمة الجزرية ل ٦٤- ٦٥

## سەرچاوەکان


- إحكام الأحكام في تجويد القرآن سيد جمعه سلاّم
- أحكام التجويد بدون مؤلف
- أحكام التلاوة عادل نصار
- أحكام قراءة القرآن الكريم محمود خليل الحصري
- أضواء البيان في معرفة الوقف والإبتداء جمال إبراهيم القِرش
- أطلس التجويد دار الغوثاني للدراسات القرآنية
- إعانَةُ المستفيد بضبط مَتنَي" التُّحْفة وَالْجَزَرِيَّة " حسن مصطفى أَحمد الْوَرَّاقِيِّ الْمِصْرِيِّ .
- برنامج أحكام التجويد
- البسيط في علم التجويد بدر حنفي محمود
- تيسير الرحمن في تجويد القرآن د سعاد عبدالحميد
- الجامع الكبير في علم التجويد نبيل بن عبدالحميد بن علي
- حق التلاوة حسني شيخ عثمان
- الروضة الندية شرح متن الجزرية محمود محمد عبد المنعم
- السهل المفيد فى أحكام التجويد إبراهيم أحمد
- متن السلسبيل الشافي في علم التجويد عثمان بن سليمان مراد
- علم التجويد د يحيى عبدالرزاق الغوثاني
- غاية المريد في علم التجويد عطية قابل نصر
- فتح رب البرية شرح المقدمة الجزرية صفوت محمود سالم
- كيف تقرأ القرآن محاضرات الدكتور أيمن سويد
- لآلئ البيان في تجويد القرءان إبراهيم على شحاتة السمنودي
- مذكرة في التجويد محمد نبهان بن حسين بن نبهان
- المفيد في علم التجويد شهاب الدِّين أَحمد بن بدرالدِّين بْن إبراهِيم الطِّيبِيّ
- نهاية القول المفيد في فن التجويد محمد نصر
- هداية القاري إلى تجويد كلام الباري عبد الفتاح السيد عجمي المرصفي

- الوجيز في تجويد الكتاب العزيز — د محمد بن سيدي محمد الأمين
- صحيح البخاري — محمد إسماعيل البخاري
- صحيح مسلم — مسلم بن الحجاج القشيرى النيسابوري
- مسند الإمام أحمد بن حنبل — مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها
- شرح رياض الصالحين — محمد بن صالح العثيمين
- السلسلة الصحيحة — محمد ناصر الدين الألباني
- صحيح أبي داود — محمد ناصر الدين الألباني
- صحيح الترغيب والترهيب — محمد ناصر الدين الألباني
- صحيح الجامع الصغير — محمد ناصر الدين الألباني
- ضعيف الجامع الصغير وزيادته — محمد ناصر الدين الألباني
- ضعيف وصحيح سنن ابن ماجة — محمد ناصر الدين الألباني
- تەفسیری ڕامان — ئەحمەد کاکە محمود
- ئەنتەرنێت

# ناوەڕۆك

بەشی پێنجەم:



تێهەڵکێشکردن (الإدغام):

بەشی شەشەم:



بەشی حەوتەم :

یاساکانی میمی زەننەدار (ساكن)



بەشی هەشتەم :